


# ئەفسانە و پەندی کۆمیدی گاڵتە ئامێزی کوردی

(( لێکۆڵینەوە ))

**د. نەجم ئەڵوەنی**

**ماموٚستای کوٚلیژی زمان/ بەشی زمانی کوردی**

**زانکوٚی سەلاحەددین/ هەولێر**

**زنجیره کتیبی کەلەپووری**
**دەزگای موزیك و کەلەپووری کورد**
**ژمارە (17)**

خاوەنی ئیمتیاز: **وەزیری رۆشنبیری**
سەرنووسەر: **هەنگاو ئەنوەر شیخانی**
**hangawanwar@yahoo.com**

سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری: **پ.د. شوکریە رەسوول**
ئەنجومەنی ڕاوێژکاری: **د. محەممەد عەزیز زازا**
**m.zaza@kurdish-music.org**
**مەحموود زامدار**
**سالار عوسمان**
**سدیق خالید**

---

ناوی کتێب: **ئەفسانە و پەندی کۆمیدی گاڵتەئامێزی کوردی**
نووسینی: **د. نەجم ئەڵوەنی**
دیزاینی بەرگ: **ئاسۆ مامزادە**
سەرپەرشتی چاپ: **عیماد ڕەشید پیرداود**
چاپ: **چاپی یەکەم2007 / هەولێر**
**ساڵی چاپ/ 2007 ز**
تیراژ: **1000 دانە**
**چاپخانەی دارا**
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ) ساڵی 2007ی دراوەتێ

---

**ناونیشان: هەولێر/ ژێر زەمینی کتێبخانەی گشتی هەولێر/ بەرامبەر وەزارەتی تەندروستی**
**تەلەفۆن: 2238301 – 2238302 – 2519558**

# پێڕستی ناوەڕۆك

# پێشەکی

باس و لێکۆلینەوە دەربارەی کێشەی ئافرەت بایەخێکی زۆری دەبێ, بە تایبەتی ئەگەر ئەو کارە لە بواری ئەفسانەدا ئەنجام بدرێ. سەرەڕای گرنگی ئەفسانە لە بیرو بۆچوونی کۆمەڵی کورەدەواریدا, تاکو ئێستا بە گوێرەی پێویست لێکۆڵینەوە لەمەڕ ئەم بابەتە نەکراوەو دەبێ نووسەرانی ئێمەش وەکو نووسەرانی جیهان خەمێکی ئەم مەسەلەیە بخۆن و هەوڵ بدەن سوود لە ئەفسانە بۆ لێکۆلینەوەی بیری مرۆڤی سەرەتایی کورد وەربگرن. لەبەر ئەوەی کێشەی ئافرەت لە ئەفسانەدا, بە تایبەتی لە کۆمەڵگای دایك سالاری و باوك سالاریدا بایەخێکی ئەوتۆی پێنەدراوە, کەشیاوی باس و لێکۆڵینەوە بێ, بۆیە بە گرنگمان زانی ئەم باسە بۆ ئەو بابەتە تەرخان بکەین. ئەم باسە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە دەربارەی وەزعی ئافرەت لە ئەفسانەی سۆمەری و بابلی و ئاشوری ... هتد بۆ پالپشتی بۆچوونەکانمان بە گوێرەی دەرفەت ئاماژەمان بۆ هەندێ ئەفسانەی یۆنانی کردووە کە دەربارەی هەمان مەبەستن پاشان باسەکەمان بەم شێوەی خوارەوە دابەش کردووە:

بەشی یەکەم: ئەفسانە چییە؟

ئەم بەشە بریتییە لە لێکۆڵینەوەو باسکردنی واتای ئەفسانە و شیکردنەوەی چەمکی ئەفسانەو دیارکردنی پێناسەیەکی گونجاو بۆ ئەفسانە و پیشاندانی نرخی ئەفسانە لە بواری زانست و ژیانی ڕۆژانەدا.

بەشی دووەم: ئافرەت لە کۆمەڵگای دایك سالاری دا

ئەم بەشە پێکهاتووە لە :

أ- ئافرەتی خواوەند سەرچاوەی بوون و هێمای ژیان.

ب- دەسەڵاتی ئافرەتی خواوەند لە کۆمەڵگای دایک سالاریدا.

لە لقی (أ) باسی ئەوەمان کردووە, کە چۆن ژیان لەرەگەزی مێینەوە دەست پیٚ دەکاو ئافرەت وەکو خواوەندێك لە ئەفسانەدا چۆن توانیویەتی بوون بە مرۆڤ ببەخشیٚ و پاشان چۆن دەتوانیٚ ببێتە هۆیەك بۆ ژیانەوەی بەرهەمی زەوی و گەشانەوەی سروشت پاش هەڵوەرینی.

لە لقی(ب) باسی دەسەڵاتی ئافرەت وەکو خواوەندێك لە کۆمەڵگای دایك سالاری دا کراوە و ئاماژەمان بۆ ئەوە کردووە, کە چۆن ئافرەت وەکوو بوونێکی پیرۆز و دایکی هەموو خواوەندەکان لە پەرستگاکاندا پەرستراوە و پیاویش وەك پاشەبەندیٚ چۆن لاسایی ئەوی کردۆتەوە و هەوڵی داوە ڕەزامەندی خواوەندی ئافرەت مسۆگەر بکات.

بەشی سێیەم: ئافرەت لە کۆمەڵگای باوك سالاریدا:

ئەم بەشە تەرخان کراوە, بۆ باسکردنی چۆنیەتی ڕوودانی ئەو کودەتا مێژووییەی کە خواوەندی پیاو بەسەر خواوەندی ئافرەت دا کردوویەتی و هەرچی دەسەڵاتی ئەوە بۆ خۆی زەوتی کردووەو پلەی خواوەندێتی ئەوی لە کۆمەڵگادا نەهێشتووە.

# بەشی یەکەم

# ئەفسانە چییە؟

وەکو چۆن باسکردنی ئەفسانەو شیکردنەوەی ناوەڕۆکی بەزۆر شێوەی جیاواز کراوەو هەر زانایەك بەپێی تێراونینی خۆی تەمەشای ئەم بابەتەی کردووە هەروەها لە پێناسەکردنی ئەفسانەش دا گەلێك بۆچوونی جیاواز لە ئارادا هەیە. هەندێك دەڵێن: ((داڕشتنی وشەی ئەفسانە لەو قسانەوە هاتووە کە بێ ڕەسەنن یان سەیرو سەمەرەن و دەکەونە دەرەوەی سروشت و بۆچوونی ئاسایی خەڵکەوە))(6,ل8) هەر لەبەر ئەوەش بووە ماکس مۆلەر((ئەفسانە بە سەردەمێکی شێتانەی مێشکی مرۆڤ زانیوە))(12, ل14-15), هەروەها هێربێرت سیبنسەر ئەفسانەی بە هەڵەی مرۆڤی سەرەتایی داناوەو وتویەتی مرۆڤە سەرەتاییەکان ((نەیانتوانیوە لە واتای بوونەکان بگەن, بۆیە لە ناسینی شتەکاندا هەڵەیان کردووە))(7, ل17).

مرۆڤ لە رۆژانی یەکەمی ژیاندا هەوڵی داوە خۆی بناسێ و جێ پێی لە گەردووندا دیار بکاو لە دیاردەکانی دەوروبەری وردبێتەوە. خەونی بەو هۆکارانەوە دیتوە, کە پێیان بتوانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ژینگەی ئەو سەردەمەدابسەپێنێ, بۆیە دەتوانین بڵێین ((ئەفسانە خەونی گەلان بووە)) (14, ل113), لە ململانێی نێوان ژیان و مردن, نەزانین و زانین هەنگاونان بۆ ئاشنا بوون لەگەڵ دیاردەکانی گەردووندا. لە ئەنجامی تاقی کردنەوەو بیرکردنەوەدا ئەفسانانەیان داهێناوەو بۆتە (( زمانی ژیانی راستەقینە))یان (2, ل8-9), هەروەها ئادەمیزاد وەکو (( ڕاڤەیەك بۆ ئەو خۆشی و ناخۆشیانەی ژیانی سەرەتایی,کە هەندێ -طقوس-ی تێدا بووە, بۆ مانەوەو زگ و زا - ئەفسانەی- بە پێویستییەکی گرنگ زانیوە))(12, ل56) لەبەر ئەوە ئەفسانەی خوڵقاندووە.

بۆ پاراستنی ژیان, مرۆڤی سەرەتایی هەندێ ڕێ و ڕەسمی ئایینی دامەزراندووە. بەهۆی ئەو ڕێ و ڕەسمانەوە ویستویێتی پەیوەندی لەگەڵ هێزەکانی سروشتدا دروست بکات و کاریان تێ بکات. لە سەرما و برسێتی و مردن و نەخۆشی بیان پارێزێت. لەبەر ئەوە دەبینین ئەفسانەکانیشیان ڕەنگدانەوەی ئەو ئاوات و خۆزگانەیە. ئەو جۆرە هەست و بیرکردنەوانەش لە یەکەم کۆمەڵگای سادەی مرۆڤدا بە بناغەی دۆزینەوەی خودو دامەزراندنی یاسای کۆمەڵگای ئایینی دادەنرێ و ئەوەش دەسەلمێنێ کە ((کۆمەڵ خولقێنەری هێزی ڕەوشتییە و ئەو هەستەی لای مرۆڤ بەرپاکردووە, کە پێویستی بە پالپشتی هێزێکی لە بن نەهاتووی داکۆکی کەرو پارێزەرە))(10,ل78),واتە ئەفسانە تەنیا هەندێ قسەی ناڕەسەن و بێ مانا نییە, بەڵکو((قەپیلکێکە مرۆڤی سەرەتایی تێڕوانینی خۆی بۆ گەردوون ڕژاندۆتە ناوی و ڕاڤەی بوونی پێکردووەو لە ڕێگەی ئەوەوە پەیوەندی بە سروشتەوە کردووەو ڕادەیەکی بۆ ترس و دوو دڵی و پرسیارە زۆرەکانی خۆیداناوەو (( بەری تاقی کردنەوەو هەڵوێستی ڕۆژانەو دیتنی دیاردەکانی سروشتی وەکو شێوازێکی لێکدانەوەو شیکردنەو پێکردووە))(12, ل187).

ئەفسانە بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خواوەندەکان, مرۆڤ و دیاردەکانی سرووشت نیشاندەداو پوختەیەکی مێژووی بڕوای مرۆڤەو سەرەتاکانی بوونمان بۆ دەگێڕێتەوە.  زۆربەیان وەکو حەکایەتێکی پیرۆز, کردەوەی خواوەندەکان دەگێڕنەوە. (9, ل15-16)

# بەشی دووەم:

# ئافرەت لە کۆمەڵگای دایك سالاری دا

## (أ)– ئافرەت سەرچاوەی بوون و هێمای ژیان

سەرچاوەی بوون و ژیانەوەو چۆنێتی سەرهەڵدانی ژیان مشتومڕێکی زۆری لەسەرە, هەندێ ئافرەت بەسەرچاوەی بوون و پیت و فەڕ دادەنێن و هەندێکیش پیاو. لەمەڕ ئەم مەسەلەیەو بە گوێری لێکدانەوەی ئەفسانەی هەندێ گەلان دەتوانین بەشێك لەو بیرو بۆچوونە جیاوازانە بخەینە بەرچاو.

سۆمەری و بابلی و گەلانی تری دانیشتوی عیراق, ئافرەت بە سەرچاوەی بوون دەزانن و دەڵێن ژیان لە ئافرەتەوە دەستی پێ کردووە. بە بڕوای ئەوان یەکەمین ناوی گەردوون ((خواوەندێکی مێ بووە پێیان دەگوت –نەمۆ– یان دەریای یەکەم. لە–نەمۆوە– خواوەندی نێرینەی –ئانۆ– واتا خواوەندی ئاسمان و خواوەندی –کی– مێینە, واتا خواوەندی زەوی لە دایك بووە. پاشان لە ئەنجامی جووت بوونی ئەوانەوە خواوەندی –ئانلیل– کە خواوەنی بایە... لە دایك بووە. هەر ئەویش بووە بەهۆی لێك جیابوونەوەی ئان و کی. –ئان– بووە بە خواوەندی ئاسمان و –کی–بووە بە خواوەندی زەوی یان خانمە مەزنەکە)) (1,ل16“1چ1, ل38), لەم ئەفسانەدا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە ڕەگەزی مێ سەرچاوەی هەموو بوونێك بووە.

لە دۆڵی ڕافیدەین یاخود میزۆپۆتامیادا مرۆڤ بڕوای وابووە (( کە خواوەندەکان بۆ خزمەتی خۆیان مرۆڤیان دروست کردووە بۆ ئەوەی: بیانپەرستن و قوربانیان بۆ پێشکەش بکەن و پەرستگایان بۆ دروست بکەن))(13,ل374), ئەم کارەش (دروستکردنی مرۆڤ) لەسەر خواستی خواوەندی دایك ئەنجام دراوە هەروەکو چۆن –نەمۆ–ی دایکی –ئانکی– داوا لە – ئانکی[1]– دەکات مرۆڤ بۆ خزمەتی خواوەندەکان دروست بکات و دەڵێ:

---

1– ئانکی: خواوەندی ئاوی پیرۆز و عەقڵ و زیرەکی و هونەر و پیشەسازی و خولقێنەری مرۆڤ بووە. بڕوانە: ( 6, ل 44–45 ).

**((ئەی کوڕم, لەجێی خۆت     هەستە, هەستە لە (...) کارێکی پەسند بکە بۆ خواوەندەکان نۆکەر دروست بکە, خواردنیان بۆ بکەن))(9,ل27)**

**لە ئەفسانەی بابلی دا خواوەندی دایك کە ناوی (مامی) یان( ننماخ) یاخود( ننخرساك) بووە, دایکی گەورەی هەموو خواوەندەکان بووە و پلەو پایەی تایبەتی خۆی هەبووە. پێیان وتووە دایکە گەورە ((هەروەها زەوی و خاکی بە پێت ...    ئەرکەکانی دایکە گەورە دوو خواوەند واتا ننتۆ(–مامی–ننماخ, ننخرساك) و عەشتار پێی هەستاون))(9, ل87). بێجگە لەوەش مامی هەر خۆی خولقێنەری ڕەگەزی مرۆڤ بووە وەکو لەم ئەفسانەدا هاتووە:**

**(( تۆیاریدەی خواوەندەکانی –مامی– ئەی–زانا[2]– و تۆی منداڵدانی دایك**

**ئەی خولقێنەری توخمی مرۆڤ**

**مرۆڤ دروستکە بارەکە هەڵدەگرێ**

**ماندوویێتی ئیش کردن لە کۆڵ خواوەندەکان دەکاتەوە))(9,ل81–82).**

**سەرەڕای ئەوەی کە تا ئەمڕۆ تەمموز ( واتا ڕەگەزی نێر ) بە هێمای پیتاندن و ژیانەوەی زەوی و هاتنی بەهار دادەنرێ و هەندێ نووسەر دەڵێن دووبارە بوونەوەی ژیان و کارەساتی مردن بە شێوەیەکی تراژیدی لە کەسێتی ئەودا یەك دەگرێتەوە. ( 12 , ل 52 ). هەروەها لەبەر ئەو تراژیدیایە هەندێ نووسەری دیکە (( بە خۆشەویسترین خواوەندی نێو خەڵکی دەزانن و وەکو مرۆڤێکی ڕاستەقینە تەماشای ئازارەکانی مردنی ئەو دەکەن )). ( 9 , ل 271 )و هەڵسانەوەو چوونە ئاسمانی وەکو هەڵسانەوەو چوونە ئاسمانی حەزرەتی مەسیح تەماشا دەکەن. کەچی بە وورد بوونەوە, لە هەندێ ئەفسانەی سۆمەری و بابلی و فینەقی و فیرعەونی پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەمان بۆ بەدەر دەکەوێ و ڕەگەزی مێ وەکو (ئەنانا) و (عەشتار) و(ئێزیس), (عونات) دەبنە هۆی نوێ بوونەوەی ژیان و بووژانەوەی سرووشت و گەشەکردنی بەروو بوومی ڕووی زەوی. بۆ نموونە کاتێ کە ((عەشتار بەند دەکرێ خۆشەویستی و پێت فەڕ لە**

---

2– لە باتی (ایتها الحکیمة) بەکارم هێناوە.

ڕووی زەوی نامێنێ و دەسەلاتی – ئەللات[3] – , کە دەسەڵاتی خۆرەتاوێکی سوتێنەر و تێنووێتی هێنەر و نەبوونی و هەژاری و خراپەکارییە بەسەر زەوی دا دەسەپێنرێ)). (7, ل126). بەند کردنی(عەشتار) نەك (تەموون), کە لە باتی (عشتار) ڕەوانەی ژێر زەوی دەکرێ, دەبێتە هۆی ڕاوەستانی ژیان و نەمانی دەغڵ و دان و بەربوومی زەوی و هاتنی خەزان, چونکە (عەشتار) هێمای کۆمەڵگای کوشتوکاڵ بووە و (تەموون)یش هێمای کۆمەڵگای شوانکاری بووە ((ئێمەش ناتوانین لە شوانێك بخوازین ڕۆڵێکی ئەوەندە گرنگ لە تراژیدیایەکی کۆمەڵگای کشتوکاڵی دا بگێڕێ))(9, 271), هەروەها ((وادیارە قوربانیدان بە شوانێك مەرجی سەرکەوتنی کشتوکاڵ و تەواو کردنی خوڵی پیتانی زەوی بووە.... بەڵکو بگرە ئەو قوربانییە, بۆ دابین کردنی بەردەوامی شارستانیەتی کۆمەڵگای کشتوکاڵی کارێکی پێویست بووە)).(9, ل287).

لە ئەفسانەی فیرعەونی دا ئافرەت نەك هەر تەنیا سەرچاوەی بوون و بوژانەوەی زەوی و زارە بەڵکو بگرە دەتوانێ مردووش زیندوو بکاتەوە هەروەکو لە ئەفسانەی ( ئێزیس) دا هاتووە: ((–ئۆزیریس– ی مێردی –ئێزیس– کە لەئەنجامی پیلانێك پاش 28 ساڵ فەرمانڕەوایی بەدەستی –ست–ی برای دەکوژرێ, ئێزیسی ژنی لاشەکەی بۆ میسر دەگێڕێتەوەو بە هێزە ئەفسووناوییەکەیی و بە یارمەتی –پوپ– و – ئۆنۆبیس– و – حۆرس– دەتوانێ ژیان بۆ لاشەی مێردە مردووەکەی بگێڕێتەوە))(8,ل83). لەم ئەفسانەشدا دەردەکەوێ کە ئافرەت نەك تەنیا خۆشەویستی دەخولقێنێ, بەڵکو دەتوانێ مردووش زیندوو بکاتەوە.

---

3– ئەللات: خواوەندی هەتاو یان هاوینە, پێش 3000 ساڵ لە ئەدەبی بابلی, لە هۆنراوەی سوارچاکی ئەزدۆباردا بەکارهاتووە. بڕوانە
( 7 , ل 127 ) پەراوێز .

**(ب)– دەسەڵاتی ئافرەتی خواوەند لە کۆمەڵگای دایك سالاری دا**

لە سەرەتای بوونەوە ئافرەت خاوەنی دەسەڵات بووە و لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پلەو پایەی بەرزی ئایینی تا دەگاتە پلەی خواوەندێتی و دایکی هەموو خواوەندەکان بۆ ئەو تەرخان کرابوو. تەنانەت مردن و ژیان بە فرمانی ئەو جێ بەجێ دەکران. بۆ دیاریکردنی ڕووی ڕاستی ئەم مەسەلەیە باشترین بەڵگەمان لە ئەفسانەی سۆمەری و بابلی دا دەست دەکەوێ. لەبیری ئەو دوو کۆمەڵەدا, بە تایبەتی لە کاتی سەردانەکەی (ئەنانا) یان(عەشتار) بۆ جیهانی مردووان و بەدیل کردنیان لە ژێر زەوی وەکو نموونەیەکی باڵا دەستی هێزی دایك لە بەخشینی ژیان و نوێ بوونەی سرووشت دا دوو وێنەی پڕ داهێنەرانەی خەیاڵی مرۆڤی سەرەتایین بۆ پیشاندانی ڕۆڵی خواوەندێتی دایك کە ((مەڵبەندی جەماعەت و سەرچاوەی بەها جوانەکانی بووە, لە کۆمەڵگایەکدا کە نێری تێدا پاشبەند و دایکی تێدا لە باتی باوك سەرکردە بووە. لە جاری یەکەمدا تەمووز –دەموزی– بە فرمانی ئەو بۆ مردن نێرراوە. لە جاری دووەمیش دا بۆ ئارەزووی خۆی ئەوی گێڕاوەتەوە بۆ ژیان. لە هەردوو دۆخیشدا هەر ئافرەت خاوەنی دەسەڵات بووەو ئەمیش وەکو نێرێکی لاواز پشتی بەو ئەستوور بووەو هانای بۆ کۆشی ئەو هێناوە))(9, ل270).

لە داستانی گەلگامشی سۆمەری و بابلی دا ئافرەت دەبێتە سەرچاوەی زانست و بنیادنەری کۆمەڵگای شارستنی و لە ڕێی ئەوەوە مرۆڤی درەندەی نێو جەنگەڵ و دارستان ئاشنای شارستانی و لەنگەر گرتن دەبێ و ژیانی گاگەلی بەجێ دێڵێ و جلی مرۆڤ لەبەر دەکا و بۆ یەکمجارە لە ئاژەڵ و گیانلەبەری کێوی جیا دەبێتەوە. ئافرەت دەبێتە سەرچاوەی فێربوونی زانست و بیرکـــردنەوەو گونجاندنی لـــەگەڵ جۆرە ژیانێکی تازەدا کە لەوەو پێش لێی نامۆ بووە.

ئافرەتێکی شارەزای خۆشەویستی و دڵداری توانی ئەنکیدۆی کێوی و هاوڕێی ئاژەڵان لە خەونی نەزانین بە ئاگا بێنێ و بیهێنێتە جیهانی شارستانی و هۆشیارییەوە. داستانەکە دەڵێ:

**(( ئەنکیدۆ شەش ڕۆژان و حەفت شەڤان ل گەل دێلێ نڤست**

**پشتی ژ جوانی یان مریێ تێربوی**
**بەرییێ خودا هوگرێت خوجانەورێت چولێ**
**لێ گاڤا کیڤی یان– ئەنکیدۆ– دیتین ئەو چون زێ رڤین**
**جانەورێت چۆلی و ێڤە بازدان**
**–ئەنکیدۆ– بزدهی بێقام لاواز بوو**
**چۆکێت وی سست بون هینگا ڤیا بگەهت جانەوران**
**–ئەنکیدۆ– بێ هیزبو نەشیاو وەکی بەرێ ببەزت**
**لیبەلێ ئەو ژیر, گەلەك هوشیارو تێگەهشتی ببو**
**ئەو ڤەکەری و رۆشت خارێل بەر پێت دیهلێ**
**وی قەنج بەرێ خوددا دیمێ وێ**
**گاڤا ل گەل ئاخافتی پاش گوهێ خوداوێ**
**دێلێ ل گەل –ئەنکیدۆ– ئاخافت و گوتی:**
**–ئەنکیدۆ– تۆ گەشتی پەندی یێ و وەکی خودایەی لێهاتی ڤیجاتو**
**بۆچی ل چۆلی ل گەل جانەوەری دگەڕێ؟**
**وەرە ئەز دێ تەبم–ئورك–یاشور هەرکری بۆ مالا پیرۆز واری –ئانو– و عشتار–ێ))(4,ل64)**

هەروەها ئافرەت لە ئەفسانەی عەبری دا وەکو خواوەندێکی بە دەسەڵات خاوەنی بەهەشت بووە, بەڵام پیاوان پاش گواستنەوە بۆ کۆمەڵگای باوك سالاری توانییان لێیان زەوت بکەن))(11, ل68), باشترین بەڵگەش بۆ دەسەڵاتی ئافرەت لە کۆمەڵگای دایك سالاری دا ئەوەیە کەوا (( پیاوە ئایینیەکان لە چەژنەکاندا جلی ژنانیان لەبەر دەکردو لێویان سوور دەکردو برۆکانیان بەداو هەڵدەگرت و چاویان دەڕشت و قۆڵیان هەتا شان ڕووت دەکرد))(11,ل23).

# بەشی سێیەم:

# ئافرەت لە کۆمەڵگایی باوك سالاری دا

پاش گواستنەوەی دەسەلات و رووداني ئەو کودەتا مێژووییەی پیاو بەسەر ئافرەتدا, کۆمەڵگای باوك سالاری هاتە کایەوەو بەمەش هەروەکو مارکس و ئەنگلز دەڵێن: ((هەموو کودەتایەکی مێژوویی لە کۆمەڵدا دەبێتە هۆی کودەتایەك لە دید و بۆچوونماندا))(2,ل91-92). خاوەن دەسەلاتە نوێیەکان بەپێی بۆچوونی خۆیان پێوانەیان بۆ بەهاکانی کۆمەڵ دانا بە جۆرێ کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەواندا بگونجێ و ئەو بنەما ئابووری و سیستەمە کۆمەلایەتییەی جارانیش کە ئافرەتی تێیدا خاوەن دەسەلات و پایەی ئایینی تایبەتی بوو بەهۆی ئەو رژێمە نوێیەوە. بە ((وەچەرخانی یاسای دەسەلاتی دایك سالاری کە بە گەورەترین نوشوستی مێژوویی ڕەگەزی مێ دادەنرێ, تەنانەت لە ماڵ دا پیاو بووە خاوەنی دەسەلات و ئافرەت پایەی نەماو چەوسایەوە, تابووە دیلی پیاو و بە هۆکارێك تەنیا بەکەڵکی زاوزێ کردن بێ))(3, ل61), ئەو زانستە کۆمەلایەتییانە لە ئەفسانەدا, بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆدەنوێنن و زیاتر بۆچوونەکانمان دەسەلمێنن.

سەرەتاکانی رووخانی دەسەلاتی ئافرەت لە ئەفسانەی بابلی و ئاشوری دا بەگرتنی - ئابسۆ[4] - لەلایەن خواوەندی - ئەیا- ی زۆرزانەوە دەست پێ دەکات, چونکە - تیامەت[5]- کە دایکی هەمووانە ((تووڕە دەبێ و جانەوەرو ئەژدیها و دڕندەی دراستان و سەگی کێوی و دووپشك و ماسی ئادەمی و بەران

---

4- ئابسۆ: لە ئەفسانەی بابلی دا خواوەندی ئاوی سازگار و هێمای نێرینە و سەرچاوەی ژیان و بووژانەوە بووە. بڕوانە: ( 11 , ل 38 ).

5- تیامەت یان تەعامەت: خواوەندی ئاوی سوێرو هێمای مێینەیە. بڕوانە: ( 11 , ل 38 ).

دەخاتەوەو –کینگۆ – Kingu یان دەکاتە سەرکردەو هێرش دەکاتە سەر –ئەیا– کە مەردۆخی خواوندی بەهێزی ڕاسپاردبوو بۆ شەڕو بەرەنگاری تیامەت. ئەویش تیرو کەوان و تۆڕو چەکی سەرەکی خۆی کە زریانە هەڵگرت و لە ئەنجام دا مەردۆخ بەسەر کینگۆ و تیامەت دا سەردەکەوێ و بەمەش سەردەمی دەسەڵاتی دایك سالاری کۆتایی پێ دێ و لە باتی ئەو دەسەڵاتە سەردەمی دەسەڵاتی باوك سالاری دێتە کایەوە)).(11, ل38–39), بەو سەرکەوتنەی مەردۆخ دەرگا والاّ بووە بۆ ئەوەی بە چاوێکی نزم تەماشای ئافرەت بکرێ و بە مرۆڤێکی لاواز و بیر سست و بێ دەسەلاّت دابنرێ و پاشان بکرێتە سەرچاوەی هەموو نەخۆشی کارو کردەوەیەکی ناپەسەند.

لە ئەفسانەی یۆنانی دا ئافرەت سەرچاوەی هەموو نەخۆشی و پەتاو ئازارێکی ئادەمیزادە هەروەکو لە ئەفسانەی (باندۆرا) دا هاتووەو دەڵێ: ((–پرۆمیتیۆس–ی فێلباز بۆ دورگەی لیمنۆس چووە. لە پشکۆکەی ئاگری پیرۆزی دزیوە و لە لقێکی پووکەڵی ڕووەکێکی شاردۆتەوە و بۆ مرۆڤی هێناوە. زیۆس کە بەم دزییەی زانیوە زۆر پەست بووە ..... فرمانی بە هیفاتۆس داوە لە قوڕو ئاو لاشەیەك دروست بکات و هێزێکی کوشندەو دەنگێکی ئادەمی پێ بدا, لەمەش پاکیزەیەك دروست بکات, جوانییەکەی یەکسانی جوانی خواوەندە نەمرەکان بێت. هەموو خواوەندەکان دیاری تایبەتییان پێ داوەو ناوی لێنراوە – باندۆرا–. هێرمس خیانەت و غەدری لە دڵ چاندوەو درۆی خستۆتە دەمی, پاشان زیۆس بە دیاری بۆ – ئیمۆشیۆس–ی نەزانی ناردوە. جوانی باندۆرا کاری تێ کردووە. ئەویش پێشوازی لێکردووەو لە نێو مرۆڤدا جیاگایەکی پێ داوە.... باندۆرا گوڵدانێکی گەورەی بە دەستەکانی هەڵگرتبوو ئەوەی کە بە هەڵە سندووقی باندۆرایان پێ دەگوت کە دەمی گوڵدانەکەی کردۆتەوە, نەخۆشی و پەتای پڕ مەترسی لێوە دەرچووەو بە زەویدا بلاّو بۆتەوە.... بەم شێوەیە بە هاتنی یەکەم ئافرەت نەبوونی و بەلاّ لە ڕووی زەوی پەیدا بووە)). (8, ل164–165), لەم دەقەدا بۆمان دەرئەکەوێ باندۆرا وەکو ئافرەتێ کە هێمای هەموو

---

6– کینگۆ: مێردی تیامەت و کوڕی بووە. بڕوانە: ( 11 , ل 38 ).

دەردو بەڵایەکە, بووە بە ئامرازێك بە دەستی ئەو خواوەندانەوە کە ڕەمزی نێرینەن و لە کۆمەڵگای باوك سالاری دا ڕۆڵی خواوەندێتی دەگێڕن بۆ ئەنجام دانی هەرچی کارێکی ناپەسەندو بەڵا هێنەر بۆ مرۆڤ. بەبێ ئەوەی ئافرەتەکە خۆی ئارەزووی ئەنجام دانی ئەم کارەی هەبووبێ, چونکە تەنیا بە فرمانی خواوەندەکان بۆ ئەو مەبەستە خولّقێنراوە. بەپێی ئەو بۆچوونەیش خواوەندەکان وایان کردووە کە ئافرەت ببێتە هێمای شەڕو بەڵا لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا. ئەمەیش باشترین گوزارشتە لەو کودەتا مێژوویەی پیاو بەسەر ئافرەتدا ئەنجامی داوەو لەوەو پێش ئاماژەمان بۆ ئەم مەسەلەیە کردووە. هەر بەم شێوەیەش لە ئەفسانەی عەرەبیدا دا پاش جێگیر بوونی دەسەڵاتی باوك سالاری, ئافرەت لە پلەو پایەی خواوەندێتی هاتۆتە خوارەوە و بووە بە کەرستەی داهێنانی دەیان ئەفسانەی میللی و کراوە بە هاوکاری شەیتان لەهەر کارێکی ناڕەوادا. لەعنەتی حەوا لە ئەفسانەی میللی عەرەب دا ڕەنگدانەوەی عقڵییەتی ئەو سستەمەیە, کە ئافرەت دەکاتە دۆزەخێکی ڕەش. لە ئەفسانەی لەعنەتی حەوادا هاتووەو دەڵێ: (( بڕیارم دا هــەموو مانگێ بێ نوێژ بی... هیچ زگێ بە دڵی خۆت نەکەیی و ئەگەر ویستت منداڵت ببێ, دەبێ چەند جارێ ڕووبەڕووی مەرگ ببییەوە, پاش ئەوە کە دەمهێشت بە ئاسانی بزێیت)) (5, ل76), وەکو لەم دەقەدا دەردەکەوێ ئازارو ئەشکەنجەی منداڵ بوونی ئافرەت جۆرە لەعنەتێکە عەقڵییەتی پیاو دایهێناوە, بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو ئافرەتەی کە هێمای حەوایە و بووە بە هۆی ئەوەی ئادەم کە ڕەمزی پیاوە بە قسەی شەیتان بکاو لە بەهەشت بکرێنە دەرەوە. بەم جۆرەش پیاو دەیەوێ لە نرخی ئافرەت لە ناو کۆمەڵگای ئادەمیزادا کەم بکاتەوەو پایەکانی سستەمی باوك سالاری زیاتر بەهێز بکات.

# ئەنجامی باسی یەکەم

**لەم لێکۆڵینەوەدا بۆمان ڕوون بووەوە کە:-**

**1- لەسەرتای بوون دا لەو قۆناغەی, کەخەڵکی لەسایەی دەسەڵاتی دایك سالاری دا دەژیان, لەبەر ئەوەی ئابووری خێزان بەدەستی ئافرەت بووە یاساکانی کۆمەڵگاش دەربڕی خواست و هەست و توانا و دەسەڵاتی ئەو بوونە.**

**2- ئافرەت وەکو ڕەگەزی مێ ڕۆڵی خواوەندی خوڵقێنەری ژیان و مرۆڤی لە کۆمەڵ دا گێڕاوەو لەسەرووی هەموو خواوەندەکانەوە بووەو لە بۆنە ئایینیەکان دا پیاوان ملکەچیی خۆیان بۆ ڕەزامەندی ئافرەت پیشان داوە.**

**3- پیاو لە کۆمەڵگەی دایك سالاریدا پاشبەندی ئافرەت بووە, بەڵکو بگرە لە هەندێ شوێن و بۆنەی ئایینی دا لە جۆری جلێ و بەرگ و ئارایيشت کردن و قۆڵێ ڕووتکردن و... هتد لاسایی ئافرەتیان کردۆتەوە.**

**4- ئافرەت هێمای ژیانەوەی زەوی و بووژانەوەی سروشت و شین بوونی دەغڵ و دان و بەرووبوومی کشتوکاڵی بووە, بۆیە لە ململانێی نێوان کۆمەڵی شوانکاری, کە*(دەموز)* یان *(تەمووز)* نوێنەرایەتی دەکردو کۆمەڵی کشتوکاڵی کە *(ئەنانا)* یان *(عەشتار)* لە ئەفسانەی سۆمەری و بابلی دا نوێنەرایەتیان دەکرد, قوربانی بە *( دەموز)* یان *(تەمووز)ی* شوان دەکرێ بۆ دابین کردنی سەرکەوتنی قۆناغی کشتوکاڵی و تەواو کردنی خولی پیتاندنی زەوی.**

5- پاش کودەتای پیاو بەسەر ئافرەتداو هاتنە کایەوەی کۆمەڵگای باوک سالاری و دسبەسەراگرتنی ئابووری خێزان لەلایەن ئەوەوە, گۆڕانێکی گەورە لە یاساکانی نێو کۆمەڵ ڕووی داوەو چەمکی بیری کۆمەڵایەتی گۆڕاوەو هەموو شتێك خراوەتە خزمەتی سستەمی باوك سالارییەوە. ئەمەش زەمینەی خۆشکردووە بۆ ملکەچ کردنی ئافرەت و پاشەبەند بوونی بۆ پیاو, پاش بێبەشکردنی لە زۆربەی مافەکانی وەکو دروستکردنی مرۆۋ و ڕۆح بەخشین بە ئادەمیزاد. بە نموونە ئەفسانەی *(ئەتینا)*ی یۆنانی یان زەوتکردنی هەندێ دەسەڵاتی گرنگی خواوندێتی ژنان پاش سەرکەوتنی *(مەردۆخ)* ی بابلی بەسەر تیامەت دا.

6- لە ئەفسانەی کۆمەڵگەی باوك سالاریدا ئافرەت وەکو سەرچاوەی هەموو شەڕو بەڵاو نەخۆشییەکی سەر زەوی, کە تووشی پیاو دەبێ تەماشا کراوە, وەکو چۆن لە ئەفسانەی ( باندۆرا)ی یۆنانی دا دەردەکەوێت.

# سەرچاوەکانی باسی یەکەم


1- *أبن حمادي صالح*/ ***دراسات في الأساطير و المعتقدات الغيبية***/ دار بوسلامة للطباعة و النشر و التوزيع/ تونس/ بلا سنة الطبع.

2- *برتران ميشيل*/ ***وضعية الدين عند ماركس و أنجلز***/ ترجمة صلاح كامل/ دار فارابي/ بيروت/ لبنان 1990.

3- *بوليتزر*/ جورج/ ***أصول الفلسفة الماركسية***/ تعريب شعبان بركات/ المكتبة العصرية/ جـ2/ صيدا– بيروت/ بلا سنة الطبع.

4- *باقر*, طه/ ***داستانا گلگامشی ئەوی هەر تشت دیتی***/ وەرگێرانی سەلاح سەعدوڵلا/ بەلاڤکرنا ئەميندارياتی يا گشتی رۆشەنبيری و لاوان/ هەولێر/ بێ ساڵی چاپ.

5- الجوزو, د. مصطفى/ ***من الأساطير العربية و الخرافات***/ ط2/ دار الطليعة/ بيروت– لبنان 1980.

6- خليل, د. أحمد خليل/ ***مضمون الأسطورة في الفكر العربي***/ ط2/ دار الطليعة للطباعة و النشر/ بيروت– لبنان 1980.

7- خان, د. محمد عبدالمعيد/ ***الأساطير و الخرافات عند العرب***/ ط2/ دار الحداثة للطباعة و النشر و التوزيع/ بيروت– لبنان 1980.

8- الخوري, لطفي/ ***معجم الأساطير***/ ج1/ وزارة الثقافة و الأعلام/ دار الشؤون الثقافية العامة/ بغداد 1990.

9- السواح, فراس/ ***مغامرة العقل الأولى***/ دار الكلمة للنشر/ بيروت– لبنان 1980.

10- شكري, د. علياء/ ***علم الأجتماع الفرنسي المعاصر***/ درا الكتب الجامعية/ أسكندرية– مصر 1972.

11- الشوك, على/ ***الأساطير بين المعتقدات القديمة و التوراة***/ دار اللامي/ لندن 1987.

12- عبدالرضا, علي/ ***الأسطورة في شعر السياب***/ منشورات وزارة الثقافة و الفنون/ الجمهورية العراقية 1978.

13- علي, د.فاضل عبدالواحد/ ***مـــن الواح سومر الى التوراة***/ وزارة الثقافة و الأعـــــلام/ دار الشؤون الثقافية العامة/ بغداد 1987.

14- الفتال, علي/ ***الترابط الزمني في الفلكلور العراقي***/ مجلة التراث الشعبي/ ع4/ س3/ دار الحرية للطباعة/ بغداد 1971.

15- مظهر, سليمان/ ***قصة الديانات***/ دار الوطن العربي/ بلا مكان و سنة الطبع.

## پێڕستی ناوەڕۆك

# پێشەکی

لەبەر ئەوەی ئەفسانەی زەردەشتی بۆ ماوەی چەند سەدەیەك و هەتا پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان ڕووبەرێکی فراوانی لە بیر و بڕوای گەلی کورد پێك دەهێنا و ئێستاش کۆمەڵێ ئەفسانەی زەردەشتی لەناو کورددا بە پیرۆز دەزانرێن, بۆیە بە پێویستمان زانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ شیکردنەوەی بەشێك لەو ئەفسانە ناوبراوە تەرخان بکەین. باسەکەشمان بەم شێوەی خوارەوە دابەش کردووە :

لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ کۆمەڵێ بیرو باوەڕی جیاواز کردووە و پاشان بە گوێرەی سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی ئەوەمان بۆ ساغ بووەتەوە کە زەردەشت لە نەوەی میدیەکانە و دوور نیە کە لە سالآنی سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش زایینی لە شاری ورمێی سەر بە کوردستانی ئێران لە دایکبووبێ و هەتا کۆتاییەکانی گرێی حەوتەمی ئەو سەدەیە ژیابێ, هەر لەم بەشەدا باسی ئەوەمان کردووە کە چۆن جوولەکە بە تایبەتی پاش سەردەمی دیلێتی بابل کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەفسانەی زەردەشتییەوەو ئەوەشمان پیشانداوە کە تا چ رادەیەك کتێبی پیرۆزی ئەوان سوودی لە ئەفسانەی زەردەشتی وەرگرتووە.

لە بەشی دووەمیشدا باسی ئەوەمان کردووە کە زەردەشتییەکان بڕوایان وابووە لە ئاسمانەوە سروش بۆ زەردەشت هاتووە, هەروەها ئەوەمان ڕوون کردۆتەوە کە چۆن ئەفسانەی ململانێی خێر و شەڕ پێشی زەردەشت لەناو میللەتە ئارییەکاندا باو بووە, بەڵام ئەو یەکیانی خستووە و لە چوار چێوەی بیری یەکتاپەرستیدا گوزارشتی لێکردوون.

پاشان لە بەشی سێیەم و کۆتاییدا لەوە دواوین کە زەردەشتیەکان بڕوایان وابووە کە مرۆڤ بەبێ هوودە نەخوڵقاوە, بۆیە دەبێ لەو دونیا زیندوو ببێتەوە و بە گوێرەی *(کار و گوفتار و بڕوا)* سزا بدرێ یان خەڵات بکرێ, هەروەها بڕوایان

وابووه كه ڕۆحی پیاو چاكان دەچێته بەهەشت و به دیداری خوا شاد دەبێ, بەڵام ڕۆحی پیاو خراپان جێگایان دۆزەخه و دەبنه هاوەڵی هەمیشەیی ئەهریمەن. له دواییدا لێكۆڵینەوەكەمان به ئەنجام و دەسنیشانكردنی گرنگترین سەرچاوەكان كۆتایی پێهێناوە.

# بەشی یەکەم:

# ناسنامە و ساڵی لە دایك بوونی زەردەشت

زەردەشت وەکو مرۆڤێ, بە گەلێ شێوەی جیاواز باسی کەسایەتی و ناسنامەی نەتەوەیی و ساڵی لە دایکبوونی کراوە, بگرە بە گوێرەی ئەو ئەفسانانەی دەربارەی ئەو لە ئارادان ژیانی لە گەلێ ڕووەوە لە ژیاننامەی هەندێ پێغەمبەر دەکا و لە لایەن پەیڕەوکەرانی ئایینەکەیەوە زۆر پەرجوو *(معجزات)* دراوەتە پاڵی. جگە لەمە ڕووداوی مردنیشی بە زۆر شێوەی جۆرا و جۆر باسکراوە, بۆیە ئێمە بە باشمان زانی ئەم بەشە بکەین بە دوو تەوەرەوە و بەم شێوەی خوارەوە لێیان بدوێین :

## ناسنامەی زەردەشت :

نووسەران و مێژوونووسان لەسەر ئەم بابەتە بوونە بە دوو بەرەوە, هەندێکیان بڕوایان وایە زەردەشت لە نەوەی فارسە لەبەر ئەوەش بە پێغەمبەری ئەوانیان زانیوە. لــەم بارەیەوە *(فاروق الدملوجی)* دەڵێ: ((زەردەشت فارسە و خەڵکی ئازەربایجانە))[1], هەروەها خاوەنی کتێبی ((المدخل الی دراسة الادیان و المذاهب)) دەڵێ: ((زەردەشتی کوڕی پورشیب کە لە بنەماڵەی سیپتیمانە بە پێغەمبەری فارس ناسراوە))[2]. هۆی ئەم بۆچوونانەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە کۆندا دەوڵەتی ئێران بەناوی فارس ناسرا بوو, هەروەها لە زۆربەی سەرچاوە کۆنەکاندا زاراوەی فارس لە باتی ئێران بەکار هاتووە, ئەمەیش هۆیەکی گرنگ بووە بۆ ئەوەی گەلانی تری ئەم وولاتە وەکو بەشێك لە نەتەوەی فارس تەماشا بکرێن یاخود ڕۆڵی مێژوویی ئەوان لەبیر بکرێ. لەبەر ئەوەی ئایینی زەردەشتیش لە ئێران سەری هەڵداوەو پاشان لە هەندێ وولاتی وەکو هیند و چین و عێراقی ئەو سای ژێر دەسەڵاتی فارس بڵاوبووەتەوە, بۆیە کە باسی ئەو ئایینە کراوە گوتوویانە: *((ئایینی زەردشتی لە سەردەمی کیانییەکاندا*

***Kchaemenian ئایینی باوی وولاتی فارس و دەوروبەری بووە ...))***[3]. بەلام ئەو نووسەرانەی شارەزاییان لە مێژووی کۆنی گەلانی ئەو ناوچەیە هەبووە بە تایبەتی ئەوانەی بە شێوەیەکی دروست لە ناسنامەی نەتەوەیی زەردەشت دوواون بیر و بۆچونێکی جیاوازیان لەگەڵ نووسەرانی بەرەی یەکەمدا هەیە, ئەمان بە ڕاشکاوی زەردەشت دەبەنەوە سەر میدییەکان و دەڵێن: ***((کاتێ زەردەشت نەیتوانی بە پەیامەکەی کار لە نەتەوەکەی بکا میدییەکانی بەجێهێشت و ڕووی کردە ناو فارسەکان و داوای لێکردن بڕوا بە ئایینەکەی بهێنن))***[4]. هەروەها ((جاکسۆن)) لە کتێبە بە نرخەکەیدا کە ناوی ***((ژیانی زەردەشت))***ە سەلماندوویەتی کە: ((زەردەشت کەسێکی مێژووییە و لە خێڵی میدیاکانە))[5] جگە لەوانە ((علی سەیدۆ گەورانی))ش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ***((زەردەشت خەڵکی شاری ورمێی سەر بە هەرێمی ئازەربایجانی باکووری ڕۆژئاوا بووە, ئەو ناوچەیەش لە پێش زایینیەوە بە وولاتی میدیا ناسراوە و شوێنی کورد بووە و ئێستاش لێی دەژین و ئەمڕۆ ئەو هەرێمە بەشێکە لە ئێرانی هاوچەرخ))***[6], بە گوێرەی ئەو بەڵگانەش کە دووپاتی ئەوە دەکەنەوە میدییەکان لە وولاتی کوردستانی ئێستادا ژیاون و پایتەختی دەوڵەتەکەیان لە شاری ***((ئەمەدان Amadan یان هەمەدان بووە))***[7], یاخود هەروەکو پرۆفیسۆر ***((سایز Sayes))*** ئەڵێ: ***((مادا عەشایری کورد بوون و لە شەرقی ئاسوورییەدا جێگیر ببوون, وولاتیان تا جنووبی بەحری خیزر ئەچوو بەشی زۆریان لە خووسووسی زمانەوە هێندو-ئۆروپی و لە جیهەت عیرقەوە-ئاری-بوون))***[8], یان هەروەکو ***((بەعزێ لە مووتەخەسیسین و مووستەشریقین ئەڵێن زمانی قەومی -مەد-, زمانی کوردیی ئیمڕۆ یان ئەساسی بووە))***[9]. هەروەها بە بەڵگەی جوگرافیای شوێنی لە دایکبوونی زەردەشت کە شاری ورمێیە و کۆمەڵێ نووسەری وەکو ***((یاقوت الحموی))*** کە دەڵێ: ***((ورمێ ناوی شارێکی مەزن و دێرینی ئازەربایجانە و دەڵێن زەردەشتی پێغەمبەری مەگوسەکان لەوێ لە دایکبووە))***[10], یان وەکو خاوەنی کتێبی ***((صبح الاعشی))*** کە هەمان بۆچوون دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: ***((ورمێ ... شارێکی شکۆدارە... و دەڵێن زەردەشتی پێغەمبەری مەگوس خەڵکی ئەوێیە))***[11], بێجگە لەو پەیوەندییەی نێوان زمانی کوردی و ئاڤێستای زەردەشت کە مینۆڕسکی لە کتێبی ***((کورد))***دا بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ کردووە و دەڵێ:

*((زمانی کــوردی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەستراوە بە زمــانی ئاڤێستاوە...))*[12]. دەتوانین بڵێین زەردەشت میدی بووە و لە ڕۆژهەلاتی کوردستان (کوردستانی ئێران)، سروشی بۆ هاتووە و یەکەمجاریش لەناو میدیەکاندا پەیامی پێغەمبەری ڕاگەیاندووە بەلام لەبەر ئەوەی *((خەڵکانێکی زۆر لەناو میللەتەکەیدا ناحەزییان لەگەڵدا کردووە، بۆیە بە ناچاری ئەوێی بەجێهێشتووە و چووەتە شاری بەلخ کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ئێران و لەوێ ویشتاسەف پاشا یان گوشتاسەپ ڕێزی لێناوە و پشتگیری لێکردووە هەتا ئایینەکەی بە هەموو وولاتدا بلاوبۆتەوە ))*[13].

## ساڵی لە دایکبوونی زەردەشت:

زەردەشت وەکو کەسایەتییەکی مێژوویی تا ئێستا مێژوونووسان لەسەر ساڵ و ڕۆژی لە دایکبوونی ڕێك نەکەوتوون و هەریەکە بە گوێرەی بۆچوونی خۆی مێژوویەکی جیاوازی بۆ ئەم مەبەستە دیاری کردووە. هۆی ئەم کێشەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زەردەشت پاش خۆی هیچ بەڵگەیەکی بڕوا پێکراوی سەبارەت بە ساڵی لە دایکبوونی بۆ ئێمە جێ نەهێشتووە. هەندێ بڕوایان وایە کە *((مێژوویی ژیانی زەردەشت بۆ هەزار و هەشت سەد یان دوو هەزار یان شەش هەزار یاخود حەوت هەزار ساڵی پێش لە دایکبوونی مەسیح دەگەڕێتەوە))*[14]، کەچی هەندێکی تر دەڵێن زەردەشت لە نێوان *((شەش هەزار – شەش سەدی پێشی زایینی لە دایکبووە))*[15]، هەروەها *((د.سامی سعید الاحمد))* دەڵێ: *((لەوانەیە زەردەشت لە سەرەتاکانی ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی پێشی زایینی دەستی بە بلاو کردنەوەی ئایینەکەی کردبێت))*[16]. لەبەر ئەوەی ئەفسانەی زەردەشتی باسی ئەوە دەکات کە *((زەردەشت لە تەمەنی چل ساڵی پاش دە ساڵ خەڵوەتکێشان سروشی بۆ هاتووە))*[17]، بۆیە ئێمە بە لەبەر چاوگرتنی ئەو مێژوویەی سەرەوە کە (د.سامی سعید) ئاماژەی پێکردووە بە دووری نازانین کە ئەم مرۆڤە لە سەرەتاکانی سەدەی شەشەمی پێشی زایینی لە دایکبووبێ.

سەبارەت بە مردن و چۆنیەتی کۆچکردنی ئەم پێغەمبەرە میدییەش گەلێ بۆچوونی جیاواز لە ئارادایە, هەندێ دەڵێن زەردەشت *((پاش حەفتاو حەوت ساڵ تەمەن لە شاری بەڵخ بروسکە لێی داوە و مردووە))*[18], کەچی هەندێ سەرچاوەی تر مردنی زەردەشت بۆ ساڵانی جەنگی نێوان ئێران و تورکە تۆرانییەکانی ئاسیای ناوەڕاست دەگێڕنەوە کە گوایە *((سەربازێکی تۆرانی لە پەرستگایەکی ئاگردا ئەوی کوشتووە))*[19]. چیرۆکی مردنی یاخود کوشتنی زەردەشت هەر چۆنێك بووبێ ئێمە لەو بڕوایە داین کە لە کۆتاییەکانی گرێی حەوتەمی سەدەی شەشەمی پێشی زاینیدا ئەو مرۆڤە پاش ئەوەی توانی بناغەی ئایینێکی نوێ بۆ زۆربەی گەلانی ئێران دابمەزرێنی کۆچی دوایی کردووە.

# بەشی دووەم:

# ئەفسانەی سروش و ململانێی هێزی خێر وشەڕی زەردەشتی

## ئەفسانەی سروشی زەردەشتی:

ئەفسانەی زەردەشتی گەلێ ڕووداوی سەیر دەربارەی ژیانی زەردەشت باس دەکا, ئەو ڕووداوانەش پەیوەندیی بە هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئەو مرۆڤەوە هەیە و وا پیشاندراوە کەوا کەسێکی ئاسایی نەبووە, بەڵکو خوا هەر لە سەرەتاوە بۆ گەیاندنی پەیامێ خولڵقاندوویەتی, لەبەر ئەوەش بووە یەکمجار وەکو ڕۆحێ لە ئاسمان خولڵقاوە و ماوەیەکی زۆر لە مەلەکوتی یەزدان ماوەتەوە پێش ئەوەی بڕیاری بدرێ بچێتە خوارەوەو لە شێوەی مرۆڤ یان کوڕی مرۆڤدا خۆی بنوێنێ و خەڵکی بۆ پەیامی ڕاستی خودا پەرستی بانگ بکات.

ئەفسانەی زەردەشتی ئەوە دەردەخات کە ڕۆحی زەردەشت لە دوو شێوە و شوێنی جیاوازدا ژیاوە. لە یەکەمیاندا ڕۆح بەبێ جەستەو لە دووەمدا هەردووك پێکەوە. لە ئاسماندا بێ دایك و باوك بەڵام لە زەویدا بە فەرمانی یەزدان, پورشەسپ و دوغدۆڤا, بەوە بەختەور دەکرێن کە دەبنە باوك و دایکی نێردراوی خودا کە پاشان دەبێ بە پێغەمبەری گەلی میدی و زۆربەی گەلانی ئاری لەو سەردەمە و لەو ناوچەیە. ئەو دایك و باوکەش لەوەو پێش لە لایەن خودای ئەهورامەزداوە بۆ ئەم ئەرکە پیرۆزە هەڵبژێراون, بە پێی ئەم ئەفسانەیەش ئەوان دایك و باوکی زەردەشت نین بەڵکو تەنیا هەڵگری تۆوی ئەون بۆ ئەوەی لەسەر زەوی لە شێوەی مرۆڤدا لە دایك ببێ. ئەفسانەی ئەفراندنی زەردەشتی لەم بارەیەوە دەڵێ: ***((پاش ئەوەی خودا ڕۆحی زەردەشت لە ئاسمان دەخولڵقێنێ ماوەیەك لە ئاسمان دەمێنێتەوە پاشان بە فەرمانی یەزدان, بەهمەن و ئەردیبهەشت, ئەو ڕۆحە لە چڵێکی پیرۆزدا پەنا دەدەن و لە زەوی لەسەر لقی دارێکی دادەنێن. بە ویستی ئەو دوو فریشتەیە پورشەسپی گاوان ئەو چڵەدارە***

*هەڵدەگرێ و بۆ ماڵی دەباتەوە. تەنی زەردەشتیش لە لایەن خوردادی فریشتەی ئاو و ئەمردادی فریشتەی گیایەوە, لەگەڵ باراندا ڕەوانەی زەوی دەکرێ و لە شێوەی گیایەك دەڕوێ کە پورشەسپ چێڵەکانی بۆ لەوەڕ بۆ ئەو شوێنە دەبات و ئاژەڵەکانی لەو گیا پیرۆزە دەخۆن گوانیان پڕ لە شیر دەبێ کە دوغدۆڤا دەیان دۆشێ مێردەکەی چڵە پیرۆزەکە دەخاتە شیرەکەیانەوە. بە خواردنەوەی ئەو شیرە دوغدۆڤا سکی پڕ دەبێ و پاش نۆ مانگ زەردەشت لە شێوەی منداڵێ لە دایك دەبێ))*[20].

ئەوەی ژیانی پێغەمبەران بخوێنێتەوە تێدەگا کە خودا ئەوانی لەبەر کۆمەڵێ پیداویستی ڕۆحی و کۆمەڵایەتی خوڵقاندووە و پەیامی خۆی پێ بەخشیوون, بۆ ئەوەی خەڵکی ئاگادار بکەنەوە و لە کاری خراپیان دوور بخەنەوە و بۆ خوا پەرستنیان بگەرێننەوە. بەمەش بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوان مرۆڤێکی رزگارکەرن. دوور نییە لە ئەفسانەی زەردەشتیدا, زەردەشتیش بۆ هەمان مەبەست خوڵقابێ و لەوانەیە پێش هاتنی ئەو پێغەمبەرە گەلانی ئێران لە بارو دۆخێکی نالەباردا ژیابن و چاوەڕێی ڕزگارکەرێکیان کردبێ. بەم ئەفسانەیە زەردەشتییەکان دەیانەوێ بە خەڵکی ڕابگەیەنن کە پەیامبەرەکەیان نێردراوی خودایە و بۆ ئەو مەبەستەش لە ئاسمانەوە بۆ ناو ئەوان ڕەوانە کراوە. ئەم ئەفسانە زەردەشتییە بەناو کۆمەڵێ لە گەلانی دونیا بڵاو بۆتەوە کە یەکێ لەوانە گەلی ئیسرائیلە. ئەفسانە وەکو بیرو باوەڕێ یان لە ڕێی شەڕ و داگیر کردنەوە یاخود لە ڕێی بازرگانی و تێکەڵاوی گەلانەوە لە گەلێکەوە بۆ گەلێکی تر دەگوێزرێتەوە, لەبەر ئەوەی پەیوەندی بازرگانی لە نێوان شاری جەلیل و ئێرانی ئەو سەردەمە گەلێ بەهێز بووە خەڵکانێکی زۆر لە هەردوو لاوە بەڕێی ئاوی کەنداوی عەرەبەوە هاتوون و هەر کۆمەڵێ پێی خۆش بووبێ لە وڵاتی ئەوی تردا نیشتەجێ بووە. خەڵکی وولاتی ئەوسای ئێران زۆریان ڕوویان کردۆتە شاری جەلیل و بەشێکیان لەوی گیرساونەتەوە, ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ ئەوەی ئەفسانەی زەردەشتی کە ئایینی باوی ئێران بووە کار لە خەڵکی ئەو شارە بکاو پاشان بە هەموو شارەکانی فەلەستین و دەور و بەریدا بڵاو ببێتەوە. لەم بارەیەوە *((عباس العقاد))* دەڵێ: *((هەندێ لە مێژوونووسان لەو بڕوایەدان کە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کۆنی شاری جەلیل لەو خێڵە فارس و هیندی و*

*عێراقیانەن کە لەگەڵ کاروانی بازرگانیدا هاتوون و لە ڕۆخی دەریای ڕۆم نیشتەجێ بوون و پەیوەندیی بازرگانی خۆیان لەگەڵ دەریاکانی ڕۆژهەڵاتدا پاراستووە, هەروەها خەڵکی ئەم شارە گەلێ کەلتووری ئەو فارسانەیان وەرگرتووە))*[21]. لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچوونەدا زۆر ئاساییە مەسیحییەکان حەکایەتێکمان دەربارەی لە دایکبوونی مەسیح بۆ بگێڕنەوە کە لە زۆر ڕووەوە لە حەکایەتی لە دایکبوونی زەردەشت بچێ. ئەوان بڕوایان وایە کە *((خوا تاکە کوڕەکەی ناردە سەر زەوی و چووە منداڵدانی مەریەمی پاکیزەوە, پاشان وەکو هەر منداڵێ لە دایك بوو...))*[22], هەروەها ئەو وەسفەی کە ***Guignebert*** بۆ مەسیحی چاوەنواڕ کراوی جولەکەی کردووە گەلێ لە بیرو بڕوای زەردەشتییەکان نزیك دەبێتەوە چونکە ئەو دەڵێ: ((مەسیحی چاوەنواڕ کراو کەسێکی ئاسایی نییە بەڵکو مرۆڤێکی ئاسمانییە ***Heavenly person*** و خاوەن پەرجووە. خودا پێشەوەخت دەیخوڵقێنێ و لە ئاسمان نازناوی کوڕی مرۆڤ هەڵدەگرێ, واتا لە وێنەی مرۆڤدا لــە دایك دەبێ...))[23]. ئەم ئەفسانەیە لەوەو پێش لەناو جولەکەدا نەبووە و خوێندنەوەکانی کتێبی پیرۆز بەڵگەی ئەوەمان بەدەستەوە دەدەن کە *((ئەم بیرۆکەیە تا پاش ڕووخانی دەوڵەتی ئەوان و بەدیل بردنیان بۆ بابل و پاشان کەوتنە ژێر ڕکێفی فارسەوە))*[24], لەناو ئەواندا باو نەبووە, لەبەر ئەوەشە کۆمەڵێ لە توێژەران بڕوایان وایە کە جولەکە ئەم ئەفسانەیان لە *((ئایینی زەردەشتییەوە خواستووە))*[25].

زەردەشت وەکو مرۆڤێکی ئاسمانی هەر لە منداڵییەوە خودا هەندێ دیاردەی سەیری لە ژیانی ئەودا پیشانداوە بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی بسەلمێنێ کە ئەو مرۆڤە نێردراوی خۆیەتی و دەبێ ئەوان بڕوای پێ بکەن و پشتگیری لێ بکەن.

ئەفسانەی زەردەشتی دەربارەی ژیانی ئەو منداڵە بۆمان دەگێڕێتەوە کە: *((کاتێ زەردەشت لە دایك بوو بە جۆرێ پێکەنی هەموو ئەوانەی لەوێ بوون هەستیان بەو پێکەنینە کرد))*[26], زەردەشتیەکان دەڵێن کاتێ کە بەرەی شەڕ دیتیان ئەو منداڵە بەو جۆرە ڕفتاری کردووە تێگەیشتن ئەمە ئەو منداڵەیە کە خوا بۆ دژایەتی ئەوانی ناردووە, بۆیە هەر زوو ویستیان لەناوی بەرن. بۆ ئەم مەبەستە هاوڕێیانی *((شای دێوان ئاگریان بەردایە ئەو ماڵەی زەردەشتی تێدا لە دایك بووە کە دایکی بە ئاگاهات وای دەزانی منداڵەکەی سووتاوە کەچی دیتی*

*لەناو ئاگرەکەدا یاری دەکا بێ ئەوەی هیچ زیانێکی پێ گەیشتبێ))*[27], کە ئەم پیلانەش سەری نەگرتووە ئەوان زەردەشتیان فڕاندووە و *((خستوویانەتە ناو تەویلەی چێڵ و ئەسپەوە پاشان لە کونە گورگیان کردووە کەچی هەریەک لەو ئاژەڵ و دڕندانە پارێزگارییان کردووە و نەیان هێشتووە هاو ڕەگەزەکانیان زیانی پێ بگەیەنن، کە برسیش بووە خودا فریشتەی لە شێوەی بزندا ناردووە بۆ ئەوەی شیری بدەنێ))*[28].

کاتێ زەردەشت گەورە دەبێ و ژن دەخوازێ ژیانی ژن و مێردایەتی ئەرکە پیرۆزەکەی لەبیر ناباتەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر چەند گەورە دەبێ ئەوەندە زیاتر خولیای دیتنەوەی ڕێی ڕاست لە دڵی چەکەرە دەکا، ئەم کارەش بێ پشتیوانی خودا بۆی مەیسەر نەدەبوو. سەرەتا گومان لەو عیبادەتانە پەیدا دەکا کە میللەتەکەی ئەنجامی دەدەن، پاشان بیرکردنەوە و تێڕامان بۆ خەڵوەتکێشی دەبن و بڕیار دەدا کە ژنەکەی بەجێ بهێڵێ، بۆیە پێی دەڵێ: *((دەمەوێ ماوەیەک گوشە گیربم و بیر لە چاکە و خراپە بکەمەوە بۆ ئەوەی سەرچاوەی چارە ڕەشی خەڵکم بۆ دەربکەوێ و ڕێگا چارەیەکیان بۆ بدۆزمەوە پاشان بۆ بەختەوەری و سەر بڵندی ڕێنماییان بکەم))*[29]، بۆ ئەم مەبەستە *((لە تەمەنی سی ساڵیدا دەچێتە کێوی سبلان، بۆ ماوەی دە ساڵ خەڵوەت دەکێشێ هەتا خودا ئاڤێستای پێ دەسپێرێ))*[30].

ئەهریمەن کە نوێنەری بەرەی شەڕە لە ئەفسانەی زەردەشتیدا، هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی زەردەشت لە خشتە بەرێ و ناچاری بکات لە خودا پەرستی پەشیمان ببێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش، وەکو لە بەشی پەنجاو شەشی مینۆخورداو بەندەکانی بیست و چوار و بیست و پێنجی ئەو کتێبەدا دەردەکەوێ، دەچێتە لای زەردەشت و پێی دەڵێ: *((هەر کاتێ مەزدا لەبیر بکەیت و لە ڕاگەیاندنی پەیامی ئەو دەس هەڵگری بۆ ماوەی هەزار ساڵ پاشایەتی سەر زەویت پێ دەبەخشم، بەڵام زەردەشت بەم جۆرە وەڵامی دەداتەوە: ((مـن بڕیارم داوە تا دوا هەناسە لەم کارە پەشیمان نەبمەوە و هەمیشە دژی بەدکاری و شەڕ خوازان بجەنگێم))*[31]. ئەفسانەی زەردەشتی، بۆ ئەوەی مەزنێتی زەردەشت دەربخاو ئەوە دووپات بکاتەوە کە پێغەمبەری ئەوان تەنیا گوێ ڕایەڵی خودا بووە و لە پێناوی ئایینی حەقدا ئامادە بووە ڕۆحیش ببەخشێ، باسی ئەو هەوڵانەی

ئەهریمەنمان بۆ دەکات کە چۆن ویستوویەتی بە بەکارهێنانی زەبر و ئەشکەنجەدان ئەو پێغەمبەرە لە ڕێ لابدا. لەم بارەیەوە دەڵێ: ((*ئەهریمەن کەوتە هەڕەشە و هەوڵیدا بە زۆر زەردەشت لە پەیامەکەی پاشگەز بکاتەوە بۆ ئەمەش قورقوشمی تواوەی کرد بە گەروویدا, بەڵام بەو کردەوەش نەیتوانی بڕوای بتەوی ئەو لاواز بکات*))[32]. زەردەشتییەکان بۆ ئەوەی بە خەڵکی پیشان بدەن کە پەیامبەرەکەیان مرۆڤێکی پایەدار و بە توانا بووە کۆمەڵێ پەرجوو لە بارەی ئەوەوە دەگێڕنەوە یەکێ لەوانە بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە زەردەشت لە شاری بەڵخ بووە. دیارە سەرەتا دەسەڵاتدارانی ئەوێ بڕوایان بەو نەکردووە و لە زیندانیان ناوە. ((*ڕۆژێ لە زینداندا بە ڕێکەوت بووە بە بن پێی ئەسپەکەی گوشتاسەفەوە و سمی ئەسپەکە لە زگی چەقیووە بەڵام هیچی لێ نەهاتووە*))[33]. *کە پاشا ئەم ڕووداوەی بە چاوی خۆی بینیووە بڕوای بە پێغەمبەری زەردەشت هێناوە و بووە بە پاڵپشتی خۆی و پەیامەکەی. هەروەها دەڵێن جارێك ((لە شاری دینەوەر چاوی بە کوێرێ دەکەوێ دەڵێ: ببەن ئەو گیایەی لە چاو بکەن چاك دەبێتەوە کە ئەوانیش ئەم کارە دەکەن کوێرەکە بینایی دەکرێتەوە*))[34] بەمەش خەڵکێکی زۆر بڕوایان پێ هێناوە.

ئەفسانەی زەردەشتی باسی گەشتێکی زەردەشت دەکا کە گوایە لەو گەشتەدا چووەتە ئاسمان و خودای ئەهورامەزدای بینیووە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ زەوی. ئەو ئەفسانەیە بەم شێوە باسی ئەو گەشتە سەیرەی کردووە: ((*پاش ئەوەی زەردەشت بە سواری فاهۆمانای گەورە فریشتەکانی خودا دەچێتە ئاسمان, لەوێ خودا دەبینێ و هەر لەوێش ووشەی حەقی پێ دەگوترێ پاشان بەهەشت و دۆزەخی پیشان دەدەن*))[35].

ئایینی زەردەشتی لە سەردەمی ((*کیانییەکاندا Achaemenian گەلێ گەشەی کردووە تا ئەو کاتەی ئەسکەندەر توانی لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی پێش زایینیدا زیانێکی گەورەی پێ بگەیەنێ. دوایی لە سەردەمی ساسانییەکاندا کە ساڵی دوو سەدو بیست و شەشی زایینی دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست ئەم ئایینە بووژاوەتەوە و بووە بە ئایینی زۆربەی گەلانی ئێران تا سەردەمی هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ووڵاتە کە پاشان زۆربەی گەلانی ئەوێ بڕوا بەم ئایینە نوێیە دێنن*))[36]. دوای ئەو مێژووە ڕۆژ بەڕۆژ ئایینی زەردەشتی کزبووە و ئەمڕۆ تەنیا

له هەندێ ناوچەی ئێران و هیندستاندا خەڵکێکی کەم پەیڕەوی ئەو ئایینە دەکەن.

## ئەفسانەی ململانێی هێزی خێر و شەڕی زەردەشتی:

ئایینی زەردەشتی لەسەر بنەمایەکی ئەفسانەیی دامەزراوە کە بریتییە لە هەبوونی دوو هێزی دژ بەیەك، یەکەمیان هێزی ڕووناکی و چاکەیە، دووەمیان هێزی تاریکی و خراپەیە. بە گوێرەی ئەم ئەفسانەیە، ئەو دوو هێزە خوای ئەهورامەزدا خوڵقاندوونی و ئاوێتەی یەکتری کردوون بۆ ئەوەی کاروباری ژیان ڕێکبخەن و دژایەتییان بەردەوام دەبێ تا لە ئەنجامدا یەکەمیان بەسەر دووەمیاندا سەر دەکەوێ. بڕوا بە هەبوونی ئەو دوو هێزە پێشتر لە ئایینە کۆنەکانی میدییەکاندا باو بووە لەم بارەیەوە جیمس هێنری بریستید لە کتێبی *((سەرکەوتنی شارستانی))*دا دەڵێ: *((زەردەشت لە ململانێی بەردەوامی نێوان خێر و شەڕ ڕادەماو ئەو دژایەتییەی لە هەموو شوێنێ هەست پێدەکرد و دەیبینی کە لە ئایینی گەلی میدی و بڕوا و خواوەندەکانیاندا خۆ دەنوێنن، وای بۆ دەچوو ئەو زۆرانبازییە لە نێوان کۆمەڵێ لە هێزی خێر و کۆمەڵێ لە هێزی شەڕدا بەرپایە...))*[37]، بە بیرکردنەوە و لێکدانەوە زەردەشت بۆی دەرکەوت کە نابێ لە جیهاندا لە یەك خودا زیاتر هەبێ و هەرچی دیاردەی گەردوونە ئەو خوڵقاندوونی و سستەمی جموجۆڵی ڕێکخستوون، لەبەر ئەوە *((ئەو ڕۆحانەی خێرخوازن لەیەك خوادا کۆی کردنەوە کە ئەهورامەزدا نوێنەرایەتی دەکا و ئەو ڕۆحانەی شەڕخوازن لەیەك هێمادا بەرجەستەی کردن و ناوی لێنا ئەهریمەنی دێو...))*[38].

زەردەشت کە دەیزانی بڕوا بە هەبوونی ئەو دوو هێزە *((لە دەروونی خەڵکیدا چەسپیوە، بۆیە نەیویستوە حاشایان لێبکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە چوار چێوەی بڕوا یەکتاپەرستیەکەیدا کردنیە بناغەی فەلسەفە و بۆچوونەکانی خۆی))*[39]، بەم شێوەیە یەکەم هەنگاوی بڕوای یەکتا پەرستی لەسەر دەستی ئەو لەم ناوچەیە دامەزرا و لە ڕاگەیاندنی پەیامەکەیدا بە خەڵکی دەگوت: *((خوا تاك و تەنیا و بێ وێنە و بێ هاوتایە و ڕووناکی و تاریکی ئەو دایهێناون و هەردووکیانی بۆ حیکمەتی خۆی ئاوێتە کردووە، ئەگەر ئاوێتەی نەکردنایە ئەم*

*بوونە نەدەخوڵقا, بەو شێوەیەش دەمێننەوە تا رووناکی بەسەر تاریکیدا سەردەکەوێ...))*[40]. هەبوونی ئەو دوو هێزە ناکۆك و دژ بەیەکە بە گوێرەی ئەفسانەی زەردەشتی بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ لەم دونیا تاقیبکرێتەوە چونکە ئەوەی پەیڕەوی ڕێی چاکە بکا و پاك و بێگەرد بێ جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی خراپ و بەدکردارە, لەو دونیاش بە گوێرەی کردەوەی ئەم دونیا کەسەکان پاداشتی خۆیان وەردەگرنەوە ***(لە بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەدا بە درێژی باسی ئەم بابەتە کراوە)***. لەم ئایینەدا مرۆڤ سەربەستە لەوەی کە هەریەك لەم دوو ڕێگایە پیادە بکات یان هاوکاری یەکێ لەو هێزانە بکات. لەگەڵ ئەوەشدا زەردەشت بە ڕاشکاوی ئەوەی دەربڕیوە کە تەنیا مرۆڤە ژیرەکان دەتوانن ڕێی چاکە هەڵبژێرن. لەم بارەیەوە یەسنا دەڵێ: *((ئێستا و لە سەرەتادا هەردوو جووتە ڕۆح سروشتی باش و شەڕانی خۆیان لە بیرو بۆچوون و کردەوەدا ئاشکرا کردووە, بۆیە لە نێوان هەردوو لادا هوشیارەکان نەك گێلەکان دەتوانن باشترینیان هەڵبژێرن))*[41]. بە گوێرەی ئەو بۆچوونە بە تەواوی بۆمان دەردەکەوێ کە ئایینی زەردەشتی لەسەر بناغەی یەکتا پەرستی دامەزراوە بە پێچەوانەی ئەو نووسەرانەوە کە دەڵێن: *((زەردەشت لە ڕووی فەلسەفییەوە دوانی پەرست بووە))*[42]. بۆ ئەوەی زیاتر ئەم بۆچوونەمان دووپات بکەینەوە, باشتر وایە ئەم دوعاو نزایەی زەردەشت بکەینە بەڵگە کە دەڵێ: *((چەند بەختەوەرە ئەو کەسەی دڵی خەڵکی خۆش ئەکا. ئەی خودای من داوای هێز بۆ لاشەو ڕۆحم لە تۆ دەکەم, بۆ ئەوەی لەسەر حەق بم. ئەی خودایە ئەی پشتیوانی بڕوا و خۆشەویستی ئەو بەرەکەتە خواییەم پێ ببەخشە کە بە پیاو چاکانی دەدەی))*[43]. لێرەدا بە ڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە زەردەشت شێوەی تاکی لە قسە کردندا بەکارهێناوە و لەیەك خودا پاڕاوەتەوە بۆ ئەوەی پشتوانی بکا و هێزی پێ بدا. هەروەها زەردەشت زۆر بە توندی دژایەتی ئەو ئایینانەی کردووە ڕەگەزەکانی سروشتی تێدا پەرستراوە و داوای لە پەیڕەوکەرانی کردوون تەنیا یەك خودا بە ڕاست بزانن کە هەموو ئەو دیاردانەی خوڵقاندووە, هەر کەسێکیش دەستی لەو ئایینانە هەڵنەگرتووە بە دێوپەرستی داناوە. ***(ماکس مۆلەر)*** ئەو بۆچوونە بەم شێوەیە دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: *((زەردەشت هێرشی دەبردە سەر سروشت*

*پەرستان... و بۆ ئەوەی هەرەس بە ئایینەکەیان بێنێ خواوەندەکانیانی بە دێو ناو ئەبرد))*[44].

زۆر جار زەردەشتییەکان بەوە تاوانبار کراون کە گوایە ئەوان ئاگر پەرستن, بەڵام لە ڕاستیدا ئەوان ئاگریان نەپەرستووە بەڵکو تەنیا بە دیاردەیەکی پیرۆزیان داناوە و *((بە خواوەندیان نەزانیوە بەڵکو لەگەڵ هەتاودا بە هێمای هێزی ئەو خودایەیان داناوە کە کەس ناتوانێ بەچاو ببینێ... هەروەها ئەوان چەند جەمسەری و شەریك دانان بۆ خودای خێر و ڕاستی بە تاوانێکی گەورەیان زانیوە و بڕوایان وابووە کە ئەمە لادانە لە بڕوا بوون بە خودای ئەهورامەزدای تاك و تەنیا...))*[45], لەبەر ئەوەشە زەردەشتییەکان ناهێڵن هیچ کەسێ ئاگر بە شتی پیس بکوژێنێتەوە, ئەم بڕوایەش تا ئێستا لەناو کورددا هەر ماوە. هەروەها بێجگە لە ئاگر *((ئاو و هەوا و خۆڵیش لای ئەوان بە پیرۆز دانراون و نابێ بە هیچ جۆرێ گڵاو بکرێن))*[46], زۆربەی کوردی ئەمڕۆش بە تایبەتی ئەو تایفەی کە بەناوی ئێزیدی ناسراون هەمان بڕوایان هەیە. بۆ پاراستنی پیرۆزیی ئەو چوار ڕەگەزەی ئاماژەمان پێکردن, زەردەشتییەکان نەیانهێشتووە *((مردووەکانیان لە گۆڕا بشاردرێنەوە یاخود بە ئاگر بسووتێنرێن یان فڕێدرێنە ناو ئاوەوە بەڵکو دەبوایە لەسەر بورگێ کە ناوی ((ڕەخما)) یان ماڵی بێ دەنگییە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بە باران پاراو ببێ و پاشان باڵندە گۆشتەکەیان بخوات))*[47]. ئەم بڕوایە لەوەو پێش لەناو *((میدییەکاندا باو بووە))*[48] و ئەمانیش وەکو ئەوان لەسەر هەمان داب و نەریت ماونەتەوە. لەوانەیە ڕەگی ئەم بڕوا ئەفسانەییە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەگەر هەر کەسێ بمرێ وەکو ئەوە وایە *((لە جەنگی ململانێی نێوان هێزی خێر و شەڕدا کوژرابێ و هێزی شەڕ بەسەر ئەودا سەرکەوتبێ))*[49], بۆیە لاشەی مردوو لای ئەوان بە خاوێن نەزانراوە و بە پێویستیان زانیوە کە دیاردە پیرۆزەکانی پێ گڵاو نەکرێ. بە پاراستنی هەندێ نەریتی کۆن, زەردەشت, ویستوویەتی زیرەکانە مامەڵە لەگەڵ هەندێ بڕوای باوی نێو کۆمەڵدا بکات, بە تایبەتی ئەو داب و نەریتانەی کە لەگەڵ چەمکی یەکتاپەرستیدا دژ نین و نابنە مایەی سەرهەڵدانی بیرو بڕوای ناکۆك لەنێو پەیڕەوکەرانیدا, لە هەمان کاتدا دەبێتە زەمینە خۆش کردنێ بۆ ئەوەی خەڵکانێکی زۆر بڕوای پێبکەن و دژی نەوەستن.

# سەرچاوەکانی باسی سێیەم


1- *ادواورد براون*/ ***تأريخ الأدب في ايران***/ ج1/ البابان الأول والثاني/ ترجمة: د. أحمد كمال الدين حلمي/ جامعة الكويت ـ مطبعة الجامعة/ 1984.

2- *بير ممو فرمان*/ ***مكانة الانسان في الديانة الايزيدية: مقارنة الأديان القديمة مع الحديثة وأهمية دور الانسان فيها***/ مجلة لالش/ العدد (4)/ مطبعة الثقافة ـ هةولێر / دهوك, 1994.

3- *ب.ش. دل كوڤان*/ ***داسن***/مجلة لالش/مركز لالش/ مديرية مطبعة وزارة التربية لاقليم كردستان ـ دهوك/ العدد (6)/ 1996 .

4- *توفيق سلطان اليوزبكي*/ ***تاريخ أهل الذمة في العراق***/ط1/ دار العلوم للطباعة والنشر/ الرياض–المملكة العربية السعودية/ 1983.

5- *خدری سلیمان و خەلیلی جندی*/ ***ئێزیدیاتی***/ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا/1979.

6- *زهير كاظم عبود*/ ***لمحات عن اليزيدية***/ مكتبة النهضة ـ بغداد/ بلا سنة الطبع.

7- *سامي سعيد الأحمد*/ ***الاصول الأولى لافكار الشر والشيطان***/ مطبعة الجامعة ـ بغداد/ 1970.

8- *سعيد الديوجي*/ ***اليزيدية***/ مكتب التراث العربي/ العراق ـ الموصل/1973.

9- *سامي سعيد الأحمد*/ ***اليزيدية أحوالهم ومعتقداتهم***/ ج2/ مطبعة الجامعة ـ بغداد/ 1975.

10- *سليمان مظهر*/ ***قصة الديانات***/ دار الوطن العربي ـ بلا مكان وسنة الطبع.

11- *شاكر فەتاح*/ ***یەزیدییەکان و ئایینی یەزیدی***/ چاپخانەی کامەرانی ـ سلێمانی/ 1969.

12- *عبدالرزاق الحسني*/ ***اليزيديون في حاضرهم وماضيهم***/ مطبعة العرفان ـ صيدا, 1951.

13- *عباس محمود العقاد*/ ***ابليس***/ دار الكتاب العربي للنشر والتوزيع/ بيروت ـ لبنان/ بلا سنة الطبع.

14- *فاروق الدملوجي*/ ***الالوهية في المعتقدات الثنوية***/ ج1/ في الديانة الزردشتية/ مطبعة الشباب ـ بغداد 1954.

15- *فالح مهدي البحث عن منفذ*/ ***دراسة مقارنة بين ثماني ديانات***/ ط1/ دار بن رشد للطباعة والنشر ـ بلا مكان الطبع/ 1981.

16- محمد *وصفي أبو مغلي*/ ***ايران دراسة عامة***/ منشورات مركز دراسات الخليج العربي بجامعة البصرة ـ مطبعة الجامعة/1985.

# پێڕستی ناوەرۆك

# پێشەکی

لێکۆڵینەوە دەربارەی پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی- گاڵتە ئامێزی کوردی کارێکی هێندە ئاسان نییە و پیویستی بە سەرچاوەیەکی زانستی زۆر هەیە, کە لای ئێمە دەست ناکەون.

ئەم بابەتە بە زمانی کوردی شتێکی ئەو تۆی لەسەر نەنووسراوە, جگە لەوەی کە (د.عزالدین مستەفا رسول)[1] بە چەند نموونەیەکی کەم کە لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکات ئاوەڕی لەم بابەتە داوەتەوە, نموونەکانیش تەنیا ئەوانەن کە لە کرمانجی خواروو وەری گرتوون بێ ئەوەی لایەك بە لای سەدان نموونەی دیالێکتی ناوچەکانی دیکەی کوردستان بداتەوە بە تایبەتی ئەوانەی کە بە کرمانجی سەروو یان بە لوڕی و ... هتد وتراون. لەبەر ئەوە ئەم باسە دەبێتە یەکەمین لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ لەم بوارەدا.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودمان لە کۆمەڵێ سەرچاوەی عەرەبی و بیانی وەرگرتووە بۆ ئەوەی زیاتر باسەکەی پێ تێرو تەسەل بکەین. تاکە ئامانجیشمان ئەوەیە کە خزمەتێکی بچووکی سامانی دەوڵەمەندی ئەدەبی فلکلۆریی نەتەوەکەمان بکەین.

کۆمیدیا (***Commedy***) زاراوەیەکی کۆنی یۆنانییە, ئەم زاراوەیە دەگەڕێتەوە بۆ یەککگرتنی ووشەی ***Comms***- واتە شایی و لۆغان لەگەڵ ووشەی ***ode***- کە گۆرانی دەگەیەنی"[2]. لە راستیدا ئەم زاراوەیە لەو تێڕوانینە دوور ناکەوێتەوە, هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە لەگەڵ ئەم جۆرە هەستە جووت و هاوشان بووە، بەڵکو بگرە ناو و ناتۆرە و شەڕە جنێو و قسەی نابەجێ و ناوهێنانی ئەندامەکانی زاوزێ باشترین کەرسەی ئەم جۆرە ژانرە بووە. لەبەر ئەوەشە بە ئاسانی دانی پێدانەنراوە و دان پێدانانیشی لە لایەن مێری کۆنی ئەسیناوە بە ماوەیەکی زۆر پاش تراژیدیا کەوتووە, ئەم دواکەوتنەش دەگەڕێتەوە ((بۆ لایەنە بەرەڵلاییەکانی بابەتەکە و ئەو هەموو هێرشە توند و تیژەشی کە تیادا دەبرایە سەر دام دەزگا و پیاوانی دەوڵەت)). هەروەها لەو

سەردەمەدا, لەو شانۆ کۆمیدیانەی کە لەسەر جادە و شەقامەکان پێشکەش دەکران بەشێوەیەکی لە سنوور بە دەر جنێو و ناو ناتۆرە و نازناوی سەیر و بێ ئابڕوو بەکار دەهێنران.

لەبەر هەمان ئەو هۆیانەش بووە کە تا ئێستا لەناو کۆڕ و کۆمەڵدا ناتوانرێت بە ئاسانی ئەو جۆرە پەند و قسە نەستەقانەی کەبەم کەرستەیە وتراون بکرێنە نموونەو بخرێنە ناو باس و لێکۆڵینەوەی زانستییەوە.

پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی-گاڵتە ئامێز هەروەکو حەکایەتی کۆمیدی-گاڵتە ئامێز لەبەر ئەوە نەوتراوە خەڵکی بخاتە پێکەنینەوە بەڵکو زۆر جار مرۆڤی ئاسایی ئەم پەند و قسە نەستەقانە, یان ئەم حەکایەتانە دروست دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوانەوە ڕەخنە لە هەڵس و کەوتی سیاسەتمەداران بگرێ و سوکایەتییان پێ بکات[3].

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەست لە کۆمیدیای ناو ئەم پەندو قسە نەستەقانە تەنیا ئەوە نییە کە *((بابەتێك بۆ بانگەشە و گالتە پێ کردن و پێکەنین بێت, بەڵکو وەکو دیتمان لەوە قوڵترە و هەتا ئـێـسـتـاش هـۆیە نەك ئامانج لەلایەن جەماوەرەوە بۆ ڕەخنەگرتن لەو باردۆخە خراپەی کە تێیدا دەژین)).*

ناوەڕۆکی گالتە و گەپ خۆی لە خۆی دا گەلێك لایەن دەگرێتەوە و ڕەخنەیەکی توند و تیژ لەکار و کردەوەی خراپی تاك و کۆمەڵ, مرۆڤی سادە و خاوەن پلە و پایەی نێو کۆمەڵگا بە شێوەیەکی کۆمیدی – گالتە ئامێز دەگرێت و زیاتر مەبەستی ئەوەیە کە ئەو جۆرە کردارانە نەهێڵێ و مرۆڤ و کۆمەڵگا بەرەو ڕێگای چاکە بەرێ.

پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی ـ گالتە ئامێزی کوردی بەشێوەیەکی گشتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:-

1- پەند و قسەی نەستەقی مرۆڤ: ئەو پەندو قسە نەستەقە کۆمیدیانە دەگرێتەوە کە بەزمانی مرۆڤەوە وتراون.
2- پەند و قسەی نەستەقی گیانەوەران: ئەو پەند و قسە نەستەقە کۆمیدیانە دەگرێتەوە کە بە زمانی ئاژەڵ و پەلەوەر و باڵدار و گیاندارانی هەمە جۆرەوە وتراون.

# بەشی یەکەم:

# پەند و قسەی نەستەقی مرۆڤ

لەم بەشەدا باسی ئەو پەند  قسە نەستەقانە دەکەین, کە ڕاستەوخۆ بە زمانی مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ وتراون. واتە بێ پەنا بردنە بەر هێمایەکی دیکە. لە ڕووی ناوەڕۆکەوە پەندەکان باسی گەمژەیی مرۆڤ و موبالغە کردن و فێڵبازی و ترسنۆکی و دەست بلاوی و بێ شەرمی و خواستنی شتی ناڕێك و قسە ڕەقی لە ڕووی مرۆڤ و هەڵەگەڕی ژنان و ئاژاوە نانەوە و بی بەختی و پیری و گەلێ بابەتی دیکە دەکەن. بۆ نموونە:

(( پیاو بە گەورەیی فێری پلاو خواردن بێت دەست بۆ لووتیدەبات))[4].

لەم نموونەدا بە شێوەیەکی کۆمیدی- گالتە ئامێزانە باسی مرۆڤێك کراوە, کە هەڵە لە کارێکدا دەکا و نازانێ چون دەستی پێ بکات وەکو ئەوەی لە کاتی نان خواردندا لە باتی دەست بۆ دەمی ببات, دەست بۆ لووتی درێژ بکات.

هەروەها بۆ گاڵتە کردن بە مرۆڤی ڕەزیل و قرچۆك کە هیچ خێرێکی لە دەست نەیەت کورد وتویەتی:

***((نانی ئێکی ب ئاڤیدا چوو, گووت: بلا خێرا بابێ من بت)).***[5]

بە گوێرەی ئەم نموونەیە, ئەو مرۆڤە نانەکەی لە دەست چووە, بەلام تەنیا بۆ دڵدانەوەی خۆی وتویەتی با ئەو نانە بۆ خێری باوکم بێت ئەگینا بە ویستی خۆی بوایە هەرگیز ئامادە نەدەبوو ئەو نانەش بکاتە ئەو خێرە.

لە ڕووی خراپەکردن بەرامبەر بە کەسێك زۆر جار گوێمان لێ بووە دەڵێن *((ئەوەی لە دەرگەی کەسێك بدا, لە دەرگەی دەدرێ))* یان وەکو عەرەب دەڵێ: *(( من طرق باب احد طرق بابه))*[6]. ئەم نموونەیە لەناو کوردا بەرگێکی کۆمیدی- گالتە ئامێزانەی بەبەردا کراوە و لە باتی *((دەرگەلێدان))*, *((میز بەدەرگا))* کـــردن بەکارهێنراوە. وەکو: *(( حەچی بمێزت ب دەرگەهێ ئێکی ڤە, ئێك وی بمێزت ب دەرگەهێ وی ڤە))*[7]. ئەم نموونەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە میللەتی

کورد نەك تەنیا توانیویەتی سوود لە کەلەپووری نەتەوەکانی تر وەربگرێ بەڵکو لە هەمان کاتدا شتی تازەیشی خستۆتە سەرو و مۆرکی تایبەتی خۆی پێوە ناوە ئەمەش باشترین بەڵگەی زیندویەتی کەلەپووری کورد و بیری مرۆڤی کوردمان بۆ دەسەڵمێنێ.

پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیی زۆر بە جوانی سنووری کۆمەڵایەتی دیاردەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و ئەوەشمان لێ داوا دەکات کە باش نییە ئەو سنوورە دژ بە لۆجیکی ژیان و ڕاستی دیاردەکان پێشێل بکرێن چونکە لەو حاڵەتەدا زیانی لە سوودی پتر دەبێ. ئەو ئامۆژگاریەمان بەم شێوە کۆمیدیە پیشان دەدات و دەڵێ: ((مردوو زۆر دەستی پیا بێنی, لە کاتی شۆردنیا ئەترێ)).[8]لەم نموونەدا بەو پەڕی کۆمیدیانەوە دوو جەمسەری دژیەك *(ژیان- مردن)* لە ووشەی *(ئەترێ)* دا کۆکراوەتەوە بۆ ئەوەی وەکو موبالەغە کردنێك لە ڕستەی *( زۆر دەستی پیابێنی)* سەرنجی ئادەمیزاد, بۆ نەبەزاندنی سنووری شتەکان رابکێشێ.

پەندی کۆمیدی- گالتە ئامێز خۆی لە خۆیدا *((هاوار و نرکەیەکی نارەزایی و پرۆتێستە بەرامبەر بە هەموو شتێك کە بەلای ئادەمیزادەوە چەوت و نارێك بێت. ئیتر ئەو شتە یا کەسێکە یا کۆڕێکە یا دەور و زەمانێکە))*[9]. یاخود دیاردەیەکی کۆمەلایەتی یان دیمەنێکی نا بەجێی ڕەفتاری مرۆڤێکە.

مرۆڤی کوردیش هەستی بە ناشیرینی ئەو دیاردانە کردووە و کردویەتیە جێی گاڵتە و تەشەر و ڕەخنەگرتن بە مەبەستی بن برکردنی.

خۆبەزڵ زان و درۆزن و بێ دەسەڵات کە دەیەوێ گرەوی سەختی ژیان بەقسەی زڵ و بێ کردەوە بباتەوە یەکێکە لەو جۆرە نموونە ناپەسندانەی کە بوەتە مایەی گاڵتە پێ کردن و ڕەخنە لێ گرتنی کۆمەڵی کوردەواری و بەشێوەیەکی کۆمیدیانەی گاڵتە ئامێز لەپەند و قسەی نەستەقی کوردیی دا گاڵتەی پێ کراوە هەروەکو:

**(( بەترڕ گوێز ئەشکێنێ))**[10]

یان دەڵێن:

**(( بەترڕ گۆیژە ئەکێڵێ))**[11].

لەو دوو نمونەدا زۆر بە سووکی و گاڵتە پێکەرانەوە باسی ئەو جۆرە مرۆڤانە کراوە ئەوەشمان پیشان دراوە کەوا ئەوانە هیچیان لەباردا نی‌یە چونکە نەگوێز بەو ڕەقی‌یەو نەچیای گوێژە بەو سەختی و بڵندیە هەرگیز بە بای مرۆڤ ناشکێن و ناکێڵرێن.

لەناو کورددا هەروەکو میللەتانی تر, کە هەمان تێڕوانینیان هەیە, تەمەن نیشانەی دابەش کردنی قۆناغەکانی ژیانە, سەردەمی منداڵی سەرەتای بوونە, گەنجێتی قۆناغی ناوەندە, بەڵام پیری دوا قۆناغی تەمەنی مرۆڤە لە ڕووی مادی– بایلۆجی‌یەوە.

بۆ گاڵتە کردن بەو پیرانەی کە لە دوا قۆناغی تەمەن دا دەژین و ماندوێتییان پێوە دیارەو زۆر لەسەرەخۆ دەچن بە ڕێوەو هێزیان تێدا نەماوە کورد دەڵێ: *(( بە دزی ئیزرائیلەوە ئەگەڕێ))*[12].

مێژووی ژیانی کۆمەڵگایەك بریتی‌یە لە مێژووی ململانێی نێوان چینەکانی ئەو کۆمەڵە, بەڵام هەروەکو مارکس دەڵێ: *((بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی پرۆسەیەکی مێژوویی سروشتی‌یە و ملکەچی چەند یاسایەکە لەسەر توانای خەڵکی و هۆشیاری و نیازی ئەوان ڕانەوەستاوە, بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو بزوتنەوەیە توانای هۆشیاری و نیازی خەڵکی دیاری دەکات))*[13]. بەپێی ئـەو یاسا کۆمەلایەتیە ململانێی چینەکانی ناو کۆمەڵ پێویستی بەو پرۆسەیە هەیە و لە دەرەوەی چوار چێوەی هۆکارە مێژوویەکان, باردۆخی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئەنجام نادرێ. کۆمەڵگای کوردستانیش ناتوانێت ملکەچی ئەو یاسایە نەبێ و لە دەرەوەی ئەو ڕاستی‌یە مێژوویی‌یە گەشە بکات. ئەگەر بە گوێرەی ئەم بۆچوونانە تەماشای پەند و قسەی نەستەقی, کۆمیدی– گاڵتە ئامێزی کوردی بکەین ئەوا ڕاستەوخۆ ڕوو بەڕووی ئەو یاسایانە دەبینەوە.

کۆمەڵگەی کوردستان هەتا ئێستاش کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی – نیمچە پیشەسازی سروشتی دواکەوتووە و نەیتوانیوە بە تەواوی قوناغی دەسەڵاتدارێتی دەرەبەگایەتی بشکێنێ و بەرەو ئاستێکی باڵاتر هەنگاو بنێ چونکە باردۆخی مێژوویی ئەو گۆڕانکاریە نەخوڵقاوە. پەند و قسەی نەستەقیش ئاوێنەی ڕاستەقینەی بیری کۆمەڵایەتیە لە قۆناغێکی دیاری کراودا, بۆیە پاشماوەکانی ئەم قۆناغە بە تایبەتی قۆناغی کشتوکاڵی تێدا ڕەنگی داوەتەوە و

**بەئاسانی هەست بەبوونی مانەوەی ئەو ململانێیەی تێدا دەکەین واتە ململانێی نێوان ئاغا و – سەپان, ئاغا و جوتیار, بەڵام لێرەدا ئەو پەیوەندیە دژوارە بەشێوەیەکی کۆمیدی– گالتە ئامێز خۆی دەنوێنی و رەنگدانەوەی ئەو قۆناغەی تێدا دیارە چونکە یاساکانی ژیانی ئابووری ئەوەمان بۆ دەسەڵمێنن کە (( هەر قۆناغێکی مێژوویی یاسای تایبەتی خۆی هەیە))**[14]**. بۆ نموونە کورد دەڵێ:**

***(( ئاغا ڕو, خوا شوکر))***[15]***.***

**لێرەدا بە ئاشکرا دوو هەڵوێست و حەزی دژ یەك دەردەکەون:**

**یەکەمیان: باوکە ڕۆی مەرگی ئاغایە.**

**دووەمیان: خوا شوکری جووتیارە کە ڕەنگدانەی حەزێکی کپ کراوی ئەوە.**

**پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵ لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر بە گوێرەی پەیوەندی بەرهەم هێنان و شوێنی کەسەکانی کۆمەڵ لەو پەیوەندیەدا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر, تەنانەت لەناو یەك وڵاتدا بەپێی پێوەری تایبەتی چینایەتی دەگۆڕێ و بەو جۆرەش پلەی خزمایەتی و هاوسێتی و هاوڵاتیەتی دەست نیشان دەکرێ.**

**لەبەر ئەوەی میللەتی کورد لە ژێر سایەی پاشماوەی پەیوەندی خێڵەکی– دەرەبەگایەتیدا دەژی کە دوو سیما ژیانی ئابووری کۆمەڵگای کشتوکاڵی دواکەوتوون بۆیە ئەو جۆرە پەیوەندیانە تا رادیەك پتەو و نرخی خۆیان هەر ماوە, بە تایبەتی لە نێو جوتیارانی لادێ نشین دا و بگرە تا رادەیەکیش پیرۆزن و دەبێ هەموو ئەندامەکانی کۆمەڵ ملکەچی ئەو داب و نەریتانە بن و بەهیچ جۆرێك نابێت ئەو یاسایانە کە رێکخەری ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوانن پێ شێل بکرێن. ئەو بۆچوونانەی باسمان کردن لە پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی گالتە ئامێزی کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە و لەوێدا بەشێوەیەکی کۆمیدیانە هانی خەڵکی دراوە کە ئەو پەیوندیانە بەهێز بکەن و ڕێزی لێ بگرن ئەگەر چی ئەو داخوازیە لە چوار چێوەی پێکەنین و گالتە پێ کردن بە وانەی کە بەو ئەرکە هەلناسن دەر براوە وەکو:**

***(( پیاو ڕقی لە بەنە خوێنی خۆی هەڵسێ گو ئەکا بەخۆیا))***[16]***.***

واتە مرۆڤ کە ڕقی لە خزم و دۆست و عەشرەتی خۆی هەڵبسێ توشی زیان دەبێ, بەڵام لێرەدا ئەو زیانە لە شێوەیەکی کۆمیدی– گاڵتە ئامێزدا دەربڕاوە کاتێ کە خزم و کەس و کار و عەشرەت بە ( دوخین) و فرمانەکەش بە *(( گو بەخۆیا ))* کردن چوێندراوە.

لێکچواندن, کە بەشێکی گرنگی زانستی ڕەوانبێژییە ڕۆڵێکی گەورە لە ڕازاندنەوەی ووشە لەزمانی پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی– گاڵتە ئامێزدا گێڕاوە. بۆ ڕوون کردنەوەی دۆخی لێ چوو لەم بابەتەش دا, هەروەها بۆ ئەوەی لێ چوو بەشێوەیەکی کۆمیدی– گاڵتە ئامێزانە دەربخات پەندەکە هەڵدەستێ بە لێکچوواندنی بەلەوچوویەك کە مەبەستەکەی کۆمیدیانە تر پیشان بدات بۆ نموونە:–

*(( ئەگەر لووت نەبێت, چاو چاو ئەخوا))*[17].

مەبەست لەم نموونەیە ئەوەیە ئەگەر هێزێکی ناوبژیکەر نەبێت کەکار بکاتە سەر دوو هێزی دژ بەیەك ئەوا یەکتر قەلاچۆ ئەکەن. لەم نموونەدا هێزی یەکەم بە لووت و هەردوو هیزە دژ بەیەکەکە بەچاو چوێندراوە, ئەوەی خاڵی گرنگ بێت لێرەدا هێزی یەکەمە کە بە وێنەیەکی کاریکاتێری پیشاندراوە بۆ ئەوەی ئەو ڕاستییە بخاتە چوارچێوەیەکی کۆمیدییەوە.

بەگوێرەی دەسەلاتی چینایەتی و هێزی دەسەلاتدار لە کۆمەڵدا هەڵویستی ئەندامەکانی کۆمەڵ بە چەند جۆرێکی جیاواز بەرامبەر بەو دەسەلاتە لە نێوان لایەنگیر و نەیار و هەلوێست دارو بێ هەولویستی هەلپەرست و ترسنۆك کە ئەمەی دواییان جێی سووکایەتی و شەرمەزاری و گاڵتەپێ کردنی هێزە خاوەن هەڵوێستەکانە, لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەش بزانین *(( کە بێ لایەن لە ململانێی چینایەتی دا نییە))*[18]. بەڵکو بگرە گوێ نەدان بەو ململانێیە خۆی لە خۆێدا *((لایەنگرییەکی بێ دەنگی هێزی دەسەلاتدارە))*[19] ئەگەر ئەوە هەڵسەنگاندنی مرۆڤی بێ لایەن بێ, دەبێت مرۆڤی هەلپەرست بە چ جۆرێ لە ناو کۆمەڵدا باسکرابێت...؟!

بەپێی لێکدانەوەی بیری کۆمەلایەتی مرۆڤی کورد لە کەلەپوردا بەشێوەیەکی گشتی و لەپەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی– گاڵتە ئامێزدا بە شێوەیەکی تایبەتی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت, کە *((کورد زۆر دوژمنی*

*هەلپەرستی و ڕاڕایی و ڕیاکردنن, بۆیە لە پەندی پێشیناندا وێنەیەکی کۆمیدی پڕ لە پێکەنین بۆ پیاوی هەلپەرست نەخشە کێشراوە.))*[20]. وەکو:

*(( وەك پەشتەماڵی حەمام وایە, هەردەم بە بەر یەکێکەوەیە))*[21]

یان : *((وەك کەری ناوچۆگە لە هەردووك لا ئەخوا))*[22].

هەروەها مرۆڤی ئاژاوە چی بەهەمان شێوە بووە بە مایەی گاڵتەپێ کردن و ڕەخنە لێ گرتنی کۆمیدیانەی چەند پەندو قسەی نەستەقێکی کوردی وەك:

*(( خۆی لێرەیە, کلکی لە بەغدا تۆز دەکا))*[23].

ئەم جۆرە مرۆڤە وەك گیانلەبەرێکی ئەفسوناوی وێنەی بۆ کێشراوە, جگە لەوەی کە هۆکاری ئاژاوە گێڕانەکەی بۆ کلکی گێڕدراوەتەوە نەك بۆ ئەندامێکی دیکەی وەك *(دەس, دەم, تەنانەت پێ)* کە لەراستیدا ئەمانە زیاتر ئەندامی شەڕ و ئاژاوە گێڕانن, بەڵام بە دانە پاڵی کردەوە بەو ئەندامە و لە شوێنێکی دووری وەکو بەغدا خۆی لە خۆیدا پەندەکەی تێکەڵ بە جیهانی کۆمیدی– گاڵتە ئامێز کردووە.

هەروەك چۆن *( لەوەو پێش)* ئاماژەمان بۆ کرد کە کۆمیدیا لەچییەوە سەرچاوەی گرتووەو کەرستەکانی باسی چی دەکەن دەبینین لە پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی– گاڵتە ئامێزی کوردیشدا هەمان کەرەستە وەك *(ناو و ناتورە و جنیو و ناهێنانی ئەندامەکانی زگ وزا... هتد)* بەکارهاتووە بۆ ئەوەی سیمایەکی کۆمیدی– میللی بە و پەندانە ببەخشرێ و لە ڕووی مانا و مەبەستەوە کاریگەرتر بن.

مەسەلەی ئافرەت یەکێکە لە کێشە سەرەکییەکانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی. لە پەند و قسەی نەستەق دا جێگایەکی دیاری هەیە و لە زۆر ڕووەوە ئەم کێشەیە باسکراوە و لەبەر ئەوەی پەند و قسەی نەستەقیش *(( فەلسەفەی ژیانی سەرتاییە و لە مێژووی فیکردا بایەخێکی ئەوتۆی هەیە کە ئەگەر کەسێك لە لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی گەلان و گەشە کردنی فیکری لای ئادەمیزاد قووڵ نەبووبێتەوە پەی بە گرنگی نابات))*[24] بۆیە لە کاتی لێکۆڵینەوەی ئەم کێشەیەدا پێویستە بە ووردی سەرنجی بیروڕای مرۆڤی سەرەتایی کورد بدەین و ئاکامەکانی ڕوون بکەینەوە.

زۆربەی گەلی کورد موسلمانن, واتا بیری کۆمەلآیەتی ئەم ئایینە کارێکی زۆری کردۆتە سەر ژیانی ئەم نەتەوەیە و ڕۆڵێکی تەواوی لەبیری ڕۆڵەکانیدا گێڕاوە. هەرچی پەیوەندی بە ئافرەتەوەیە ئەوا کەم تا زۆر لە ڕوانگەی دەستوورەکانی ئەم ئایینەوە شوێنی بۆ دیاری کراوە. هات و چۆی ئافرەت و مانەوەی لە ماڵەوە و سەپاندنی پێچە بە سەریا, هەندێکن لەو دەستوورانەی کە دەبێت ئافرەتی موسڵمان پەیڕەویان بکات. لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: *(( و قرن في بيوتكن و لا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى))*[25]. هەروەها لە هەندێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەر *(محمد)(د.خ)* هەمان بۆچوون هەیە کە دەفەرمووێ: *((المرآة عورة, فأذا خرجت آستشرفها الشيطان))*[26]. بەم جۆرە دەرچوونی ئافرەت لە ماڵەوە ئەوندە ئاسان نەبووە, بەڵکو بگرە تا ڕادەیەکی گەورە قەدەغە بووە, بۆیە بە عەیبێکی گەورەش دانراوە. ئەم بیر و ۆچوونانە لە ناو کوردیشدا تا ڕادەیەك ئێستاش باوی هەرماوە لەوێشەوە هاتۆتە نێو پەند و قسەی نەستەقەوە و ئەو ئافرەتەی کە پابەندی ئەم یاسا ئاینیە نەبووە بووە بە مایەی گاڵتە پێ کردن و بەشێوەیەکی کۆمیدیانە ڕەخنەی لێ گیراوە. بۆ نموونە:

*(( ووتیان کابرا ژنەکەت زۆر دەگەڕێ!*

*ووتی: ئەگەر زۆر بگەڕایە ڕێی دەکەوتە ماڵی خۆشمان))*[27].

یان دەڵێن: *(( وەوی دیرم وە شەرم و حەیا , شەوەکی مەچوو ئیوارە مەیا))*[28].

لەپەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوردی دا ڕەخنەی کۆمیدیانە لە زۆر دیاردەی کۆمەلآیەتی گیراوە. قسە کردن و چۆنیەتی دەربڕینی خواست و ئامانجەکانی ڕۆژانەی مرۆڤیش یەکێکن لەو دیاردانەی کە لەم جۆرە بابەتەدا خراونەتە بەر ڕەخنەی کۆمیدیانە. بۆ نموونە:

*(( ممیکە هاجەرە کە چەڵە دایکم ووتی:دیزەیە دۆمان بۆ بنێرێ*

*ووتی: ئەو زمانە شیرینەی دایکت هەیەتی, شەپەیە کەرەشی بۆ دەنێمە بانی))*[29].

بێ شەرمی و نەوسنی خۆی لە خۆی دا دوو سیفەتن لە هەر مرۆڤێکدا هەبن دەبنە مایەی گاڵتە جاڕی کۆڕ و کۆمەڵ و بەزۆر شێوە ڕەخنەیان لێ دەگیرێ. بۆ پەند و قسەی نەستەقیش بە تایبەتی لە بابەتێکی وەك کۆمیدی– گالتە

ئامێزدا دەبنە بابەتێکی سەرنج ڕاکێشەرو لە شێوەی ڕەخنەیەکی تووندا بەدەردەکەون. وەکو:

*(( ووتی قوزەڵقورت!*

*ووتی: بە ڕونەوە؟!))*[30].

## بەشی دووەم:

# پەند و قسەی نەستەقی گیانەوەران

پەند و قسەی نەستەقی کوردی زۆربەیان ( بەرهەمی دەوری کشتوکاڵ و پاش ئەوەیە... بۆیە بە زۆری باسی ماڵات و ناوی جۆرەها ئاژەڵی وەك بزن, مەڕ, گا, ناوی تانجی و سەگ, کەر و ئەسپ, ئێستر و حەیواناتی تر هەمووی بەڵگەی ئەوەن کە ئەم پەندانە بەرهەمی ئەو پلەیەی مێژوون[31].

ئەو گیانلەبەرانە پەیوەندیەکی توندیان وەکو هێزی کارگەر و بەرهەمی کۆمەڵایەتی بە ژیانی مرۆڤی ئەو کۆمەڵەوە هەیە. زۆر جار مەرج نیە پەندو قسەی نەستەق تەنیا بە زمانی مرۆڤەوە ووترابێ بەڵکو هەروەکو حەکایەت و ئەفسانە گەڵی جار پەندو قسەی نەستەقمان بەرچاو دەکەوێت کە بەزاری ئەو گیانلەبەرانە وتراون و بوونە بە نیشانەی شتێك لە ژیانی ئادەمیزاددا.[32] هەریەك لەوانە ڕەمزی بۆچوونێکی کۆمەڵایەتی تایبەتییان لەناو مرۆڤەکانی ئەو کۆمەڵەدا هەیە, بۆ نموونە *(کەر)* وەکو هێمایەك بۆ مرۆڤی گێل و بێ عەقڵ و نەزان و هەندێ جاریش وەکو ڕەنجدەرێکی بەش خوراو بەکار هاتووە یاخود سەگ کە بووە بە هێمای وەفاداری.

هەرچۆنێك بێت ئەو گیانلەبەرانە بەهەمان مەبەست, بەڵام بە شێوەیەکی کۆمیدی– گاڵتە ئامێز بوونە بە هێما وەکو ڕەخنەیەك لەو کەسانەی کە خەوشێکی کۆمەڵایەتی, یان لاری و نەزانین و تەوەزەلییەك بەرامبەر بە کۆمەڵ دەنوێنن بەکار هاتووە. بەپێی ئەم بۆچوونانە دەتوانین بڵێین کە ئەو جۆرە پەندو قسە نەستەقە کۆمیدی– گاڵتە ئامێزانەی کە بەزاری ئاژەڵ و گیانلەبەرانی ترەوە وەکو مەیموون و قەلەڕەش, میروولە, کیسەڵ, ڕیوی... هتد ئەمانە لە سادەترین وێنەکانیدا,حەکایەتیکی ڕاڤەکەر و وێژەرەوەیە لە ڕووی گەوهەرەوە حەیکایەتێکە دەیەوێ ڕاڤەی دەردێك یاخود مەبەستێك بکات[33] . هەر بۆ ئەو مەبەستەش مرۆڤی کورد بۆ ئەوەی ڕەخنە لە دیاردەیەکی نابەجێ یاخود ڕەفتاری ناپەسندی کەسێك بگرێت پەنای بردۆتە بەر ئەم شێوە دەربڕینە تاکو بە شێوەیەکی

ناڕاستەوخۆ ئەو هەڵویستانە هەلسەنگێنێ بێ ئەوەی هەستی کەسێك بریندار بکات، یاخود رووبەڕووی لێ پرسینەوە ببێتەوە.

بەگوێرەی بابەت و کەرستە ئەو ئاژەڵ و گیانلەبەرانە دابەش دەکەین بەم شێوەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| (1) ***ڕیوی*** | (5) ***قرژاڵ*** |
| (2) ***گورگ*** | (6) ***مێستر*** |
| (3) ***قالۆنچە*** | (7) ***مێرووله*** |
| (4) ***کەر*** | (8) ***گیانلەبەری هاوبەش*** |

## (1) ڕیوی لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوردیدا:

هەر میللەتێك بەگوێرەی ئەو شوێنەی کە تێیدا دەژی و ئەو ئاژەڵانەی لەو ژینگەدا هەن حەکایەت و پەندو قسەی نەستەقی بە زاری ئەو ئاژەڵانە وتووە. مەبەستیشی لەو کارە ڕاڤەکردنی هەندێ دیاردەی کۆمەڵایەتی–سروشتییە کە لەو سەردەمەدا و بەپێی بۆچوونی سادەی خۆیان لێکیان داوەتەوە.

مرۆڤی سەرەتایی ((ئەو زانیارییانەی کە زانایانی ئاژەڵ و ڕوەکناسی لەم سەردەمەدا دەیزانن ئەوان نەیانزانیوە لەبەر ئەوەشە ئەو چیرۆکانەی *(ئەو پەند و قسە نەستەقانەی)* داناوە بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەوانەوە هۆو هۆکاری ئەو دیاردە تایبەتییانەی چنگ کەوێ [34]. هەرچی پەیوەندی بە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزەوەیە ئەوا هەوڵیان داوە لەڕیگەی ئەو ئاژەڵانەوە ڕەخنە ئاراستەی ژیان و دیاردە کۆمەڵایەتی و دەزگاکانی سەردەمی خۆیان بگرن بە مەبەستی دابین کردنی ژیانێکی لەبارتر بۆ مرۆڤ و هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی ئەو دیاردە دزێوانە کە باری ژیان سەخت و نالەبار دەکەن.

پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی کە بەزاری ڕێویەوە وتراوە شتێکی تایبەت نییە تەنیا بەگەلی کوردو هەرئەم گەلە نەبووە کە ڕێوی بە فێلبازو زۆرزان بزانێ بەڵکو لەناو گەلانی جیهاندا زۆر حەکایەت و پەندی کۆمیدی بە زاری ئەم گیانلەبەرەوە وتراوە واتــە لــە کـەلەپوری زۆر نەتەوەی تردا هەمان تێڕوانین بۆ

ئەم گیانلەبەرە هەیە. ( وەکو نەتەوەی عەرەب و گەلانی باشوری ئەوروپا)(*). بۆ نموونە کورد دەڵێ:

*(( ووتیان ریوی چەند بەند ئەزانی؟*

*وتی: نەودونۆ, چاکترینیان پێچ کردنەوەیە))*(35).

لە زۆربەی ئەو پەندانەی کە بەزاری ڕێوی یەوە ووتراون ناوی مریشکیش هاتووە. بۆ نموونە:

*(( ئەگەر ڕیوی بنویٚ خەو بە مریشك خواردنەوە دەبینیٚ))*(36).

لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوردیی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دا ناوی ڕێوی هاتووە. بۆنموونە بەزاری کرمانجی سەروو دەڵێن:

ژ رووڤی پرس کرن: *(( کیە شاعدەتەتە؟*

گووت: دیلا من))(37).

هەمان نموونە لە کرمانجی خواروودا هەیە کە ئەڵێ:

*(( بەرێویان ووت: کیٚ شاهدتە؟ ووتی: کلکم))*(38).

یان کورد دەڵێ:

{ گوتن: (( رۆڤی مەتو کری میری مریشکان رووڤی گری, گو: ژ سووێدا خوە نەباوەڕم))}(39).

یان دەڵێن: *(( رویڤی گوت من نەبن لە ناڤ مریشکا وەك دی هوین چژ من بکن ب دلٚ هەوەیە))*(40).

لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوردیی دا ڕێوی نەك تەنیا هێمایە بۆ مرۆڤی فێلباز و درۆزن و مشەخۆر بەڵکو لە هەندێ نموونەدا بۆ گالتە پیٚ کردن بەو کەسانەی لە خۆیان دەگۆڕێن و ڕەسەنی خۆیان لەبیر دەکەن بەکار هاتووە. بۆ نموونە:

*(( دوو ڕیوی لەیە و کونا دەرچگن, ئەیەکە وە ئەوەکە وەت: هارگیدە سەن))*(41).

هەروەها لە هەندێ پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی کوردیدا ئەم گیانلەبەرە بووە بە هێمایەك بۆ مرۆڤی چاوچنۆك و تەماحکار. بۆ نموونە:

*(( ووتیان مام ڕێوی, خورما ئەخۆی یان مێوژ؟*

*ووتی ئەمیش و ئەویش))*[42].

لەو نموونانەی کە لەوەو پێش باسمان کردن مەبەستی سەرەکی تەنیا بۆ پێکەنین نیە بە هەرچەندە بەشێوەیەکی کۆمیدی مەبەستەکانی تێدا دەرکـــەوتووە, بەلاَم ئەگەر بۆ پێکەنین بێت ئەوا هەروەکو مارکس دەڵێ: *((کاتێ مرۆڤ پێ دەکەنێ لە ڕابردووی پەشیمان دەبێتەوە))*[43]. واتە بە گاڵتەکردن بە کردار و ڕەفتاری ناشیرن, مرۆڤ لەو جۆرە کارانە دوور دەکەوێتەوەو بە خۆدا دەچێتەوە و هەوڵی چاککردنی خۆی دەدات.

## (2) کەر لەپەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیدا:

لە پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی گاڵتە ئامێزی کوردیدا مرۆڤی نەزان و گێل بە *(کەر)* چوێندراوە. لەم ڕووەوە زۆر نموونەمان بەرچاو دەکەوێ. وەکو:

*(( وتنەخەر: ماریفەت برەس, دوی ئەلگرت و تری))*[44].

یان دەڵێن: *((بەکەریان ووت مەعریفەت بنوێنە, لنگی هەڵبڕی و تڕێکی کەند))*[45].

هەر لەم بارەیەوە لە کرمانجی ژووروش دا نموونەیەك هەیە دەڵێ:

*(( ژ کەرێ پرس کرن چی تە باشە؟ دیلا خوە بلند کرو کرە زەڕین))*[46].

هەر بەو مەبەستە کورد دەڵێ:

(( گووتنە کەری! وەرە ئەم تە ببیبە جفەکی

گوو: ما کەڤزنۆك لەوێ هەیە؟))[47].

لێرەدا بەو پەڕی شێوەی گالتە پێ کردنەوە مرۆڤی نەزان بووە بە مایەی گاڵتە جاڕی. لە ناو کۆمەڵیشدا هەموو کەسێك هەوڵ دەدات کە بەو جۆرە کەس گالتەی پێ نەکات هەروەك گۆگۆڵ دەڵێ: (( تەنانەت ئەوەی لە هیچ ناترسێ لە گالتە پێ کردن دەترسێ))[48].

## (3) هێستر لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیدا:

لەناو کۆمەڵدا زۆ کەس هەیە کە هچیان لە باردا نیەو شانازی بەکارو کردەوەی کەسانی ترەوە دەکەن بۆ ئەم مەبەستەش لە پەندو قسەی نەستەقی

کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوردیی دا هێستر وەکو هێمایەك بۆ دەربڕینی ئەو مانایە خواستراوە. بۆ نموونە:

(( لە هێستر پرسین: کی باوگدە؟ ووت: ئەسپ خاڵومە))[49].

هەر بە هەمان مەبەست لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی عەرەبیدا نموونەیەك هەیە کە دەڵێ: {(( القرعه بتفتخر بشعر بنت خالتها))}[50]. واتە کەچەڵ شانازی بە پرچی کچی خاڵیەوە دەکات.

## (4) گورگ لە پەندو قسەی نەستەق کۆمیدی– گالتە ئامێزی کوریدا:

بۆ گالتە پێ کردن بە مرۆڤی مشەخۆر و دووڕوو, بۆ ئەوەی لە ناو خەڵکی و کۆڕو کۆمەڵ دا وەکو ***(دڕندەیەك)*** پیشان بدرێت. بە شێوازێکی کۆمیدی– گالتە ئامێز, لە باتی ئادەمیزاد هێمای (گورگ) خواستراوە تاوەکو ئەو وێنە زیاتر لەبیرو ئەندێشەی خەلکێدا ناشیرین بکرێت و هەر کەسێك هەوڵ بدات لە شێوەی ئەم هێمایە دوور بکەوێتەوە. بۆ نموونە کورد دەڵێ:

(( گوتنە گور هەرە بەرخان, گو: لنگی من دێشە!))[51].

یان دەڵێن: (( بە گورگیان ووت ئەمرۆ نۆرە شوانیتە, ووتی بە خوا پێم پەتیيە))[52].

(( گوتیانە گورگ هەروەکن مەڕێ. گوتی: پێم خواسە, بەڵام ناچارم))[53].

هەر بە هەمان واتا و مەبەست لە پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی عەرەبی دا دەڵێ:

(( الذیب سرحوه بالغنم گام یبچی))[54]. واتە گورگیان بەردایە مەڕان دەستی بە گریان کرد.

لەم نموونەدا بۆمان دەدەکەوێت کەوا هەردوو میللەتی کوردو عەرەب یەك هێمایان بۆ ئەو جۆرە کەسانە بەکار هێناوە کە ئەویش (( گورگە)) و هەردو لاش ئەم دوو مەبەستەیان لە شێوەیەکی کۆمیدی– گالتە ئامێزدا دەربڕیوە.

## (5) قرژال له پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیدا:

تەمەنی لاوی و هەرزەکاری قۆناغێکی زۆر گرنگە لە ژیانی ئادەمیزادا, چونکە گۆڕانێکی گەورە لە ڕووی دەروونی و بایۆلۆژی‌یەوە لەو قۆناغەدا ڕوو دەداو کار دەکاتە سەر ڕەفتار و هەلس و کەوتی ئەوان و تێڕوانینیان بۆ مەسەلەکان جیاوازیەکی گەورەی لەگەڵ قۆناغەکەی پێشووتردا دەبێت. لەم تەمەنەدا ئەنزیمەکانی لەش بە جۆرێکی خێراتر کار دەکەن وبەم شێوەیە لە ڕووی هەستیاری‌یەوە جۆرە توندڕەوی و خۆین گەرمی و سەرە ڕۆییەك لە ڕەفتاریاندا بەدەردەکەوێت, وەکو گوێ نەدانە هەندێك داب و نەریت وپێشیل کردنی هەندێ یاسای ڕێکخستنی کەسایەتی لە کۆمەڵدا و بەعیب نەزانینی  هەندێ هەڵس و کەوت.

لە پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردی دا ئەم هەڵس و کەوتە نائاسایی یە لە بەرگێکی کۆمیدی- گالتە پێ کەرانەدا پیشاندراوە. وەك:

((لە قرژالیان پرسی: کو بە هەردوو سەران دەڕۆی؟ گووتی: چ لەلاوان بەعیب ناگیری))[55].

یان دەڵێن: (( ووتیان قرژاڵ بۆ بە دوو سەر ئەڕۆیت؟ ووتی : بۆجوانان هیچ عەیب نی‌یە))[56].

لێرەدا قرژاڵ بووە بە هێمای ئەو جۆرە هەرزەکارانە. ئەوەش وای کردووە کە وێنەکە بە شێوەیەکی کۆمیدی- گالتە ئامێزانە, هەستی پێ‌کەنین و گاڵتە جاڕی لە ناو خەڵکدا بەرامبەر بەچەوتی هەڵس و کەوتی ئەوان بووروژێنێ.

## (6) مێروولە لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیدا:

پەند و قسەی نەستەق زادەی بیری کۆمەلانی خەڵکە بە هەموو چینەکانییەوە هەر لەبەر ئەمەشە بیروڕای جیاوازی ئەوانی تێدا ڕەنگ داوەتەوە. کۆمەڵیش وەکو دەزانرێ لە چەند چینێك پێکهاتووە" ئەو چینانەش بۆچوونیان

تاڕادەیەکی گەورە دەربڕی خواست و ئاواتی ئەوانە و بەرژەوەندییان پیشان دەدات و ململانێی نێوانیان دەردەخات. لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گاڵتە ئامێزدا ئەو بیروڕاو ململانییە بە شێوەیەکی کۆمیدیانە بە دەردەکەوێت و دەتوانین بڵێین ئەو پێکەنینەی لەم پەندانەدا دروست دەبێت خۆی لە خۆیدا دەنگی ناڕەزایی دەربرینە و رەخنە گرتنە لە باری چەوتی ژیان.

هەژاری یەکێکە لەو دەردانەی کە لە نێو کۆمەڵدا هەستی پێ دەکرێ و لە ئەنجامی ئەو چەوسانەوەیە کە مرۆڤی هەژار لە سایەی کۆمەڵی فرەچیندا تووشی دەبێ و سەرهەڵدەداو لە هەموو ژیانی ئەوان دا وەکو موتەکەیە بە دەردەکەوێ و ژیانیان لێ تاڵ دەکات. ئەم مەسەلەیە بە تەواوەتی لەپەند و قسەی نەستەق دا بە دەردەکەوێت, بەلام لێرەدا بە شێوەیەکی کۆمێدی, داخ و حەسرەتی نەبوونی ئەوان دەردە برێ. وەکو:

(( دیاری مێرووله, قاچە کوللەیە))[57].

لەم نموونەیەدا بە کۆکردنەوەی ووشەی (دیاری, مێرووله, قاچە کوللە) ئەو پەڕی دیمەنی کاریکاتێری کۆمیدیانەی- گاڵتە ئامیزی ژیانی هەژارانی ناو کۆمەڵی کوردستان و ڕادەی ئەو هەژاریەی کە مرۆڤی کورد بەدەستی‌یەوە دەناڵێنێ پیشاندراوە. لێکچواندنی ئەو دیارییە بە قاچە کوللە و مرۆڤی هەژار بە مێرووله جۆرە هۆشەکارییەکی تەواو لە دەرخستنی ئەو بارە نالەبارەدا دروست کردوە.

## (7) قالۆنچە لە پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گاڵتە ئامێزی کوردیدا:

قالۆنچە لەم بابەتەدا هێمایە بۆ مرۆڤی بەد ڕەفتارو کەچ کردەوە ئەو کەسەی کە کردەوەی چاکی لێ ناوەشێتەوە کەچی لە هەمان کاتدا دڵگران و سەخڵەت دەبێ بە کردەوەی مرۆڤی ڕەوشت بەرز و نیاز پاك. بۆ نموونە: ((قاڵۆنچە بۆنی گوڵ بکا سەری دێشێ))[58]. لێرەدا قاڵۆنچە هێمایە, بۆ مرۆڤی بەد رەفتار. کەچی گوڵ وەکو خواستنێکی ڕاستەقینە, بۆ کردەوەی جوان و

ڕەوشت بەرزی خواستراوە. بە هاتنی ( قالۆنچە- گوڵ) لەم نموونە دا گاڵتە پێ کردنێکی تەواوی بەوجورە کەسانە تێدا بە دەردەکەوێت.

## (8) گیانلەبەری هاوبەش لەپەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزی کوردیدا:

هەندێ پەندو قسەی نەستەقی کۆمیدی- گالتە ئامێزمان هەیە کە چەند گیانلەبەرێك و گیاندارێکی هاوبەشی تێدا بەکار هاتووە, بۆیە نـــاوی هاوبەشمان لێ ناوە. وەکو ((قاتر و ئەسپ و ماین و قرژال و کیسەڵ و مێشولە (پەخشە) )) چونکە ئەمانە پێکەوە وێنەیەکی کاریکاتێری کۆمیدی- گاڵتە ئامێزانەی سەیرمان بۆ دروست دەکەن, بە تایبەتی ئەگەر بەرانبەر ئادەمیزاد وەکو ڕەمزێك بەکارهێنرابن. بۆ نموونە:

(( ئەسپ و ماین ناڵ ئەکران, قرژاڵ و کیسەڵ قاچیان هەڵئەبڕی, ئەیان ووت: ئێمەش))[59]. لەم نموونەدا (ئەسپ و ماین) کە دوو وەڵاخی بەرزەن بەرانبەر بە (قرژاڵ و کیسەڵ) کە دوو گیانداری بچوکن وەکو دژیەکێکی ئیجابی لە ڕووی قەبارەوە, بۆ خۆ هەڵکێشان بەکارهێنراون. هەر ئەم پەندە لە ناوچەی خانەقیندا وتراوە, بەڵام لە ڕووی دژیەکەکەوە تاك کەوتووە وەکو: (( قاتر ناڵ کردن, پەخشە قول ئەلگرت وەت: ناڵ منیش بکەن))[60]. لێرەدا لەباتی (ئەسپ و ماین) کە لە پەندەکەی پێشوودا هاتووە ووشەی (قاتر) بەتەنیا لەم نموونەدا بەکار هاتووە. لەم پەندەدا ووشەی (قاتر و مێشوولە) هەردوکیان تاکن و دژیەکێکی قەبارەیی و تواناییان لێ کەوتۆتەوە. هەر بە هەمان واتاو مەبەست لە کرمانجی سەروودا ئەم پەندە کۆمیدی- گالتە ئامێزە وتراوە: (( ناڵبەندا کحێل ناڵ دکرن, کیڤژاڵێ (قرژاڵ), گوت: ئەڤە لنگێ من ژی))[61]. لیرەدا (ئەسپ) بەرامبەر (قرژاڵ) دژیەکێکی قەبارەیی و توانایی دروست کردووە. هەر لەم شێوە زمانەدا ئەو پەندە بەشێوەیەکی تر, بەڵام بۆ هەمان مەبەست ووتراوە: (( قاترچیان قاترێد ناڵ کرن کۆسییان ( کیسەل) لنگێ خوە بڵند کرن))[62]. لەم نموونەدا ( قاتر) بەرامبەر بە (کیسەڵ) وەکو دژیەکێکی کۆ بەکارهاتووە. لە پەندو

قسەی نەستەقی کۆمیدی– گالتە ئامێزی عەرەبیشدا نموونەیەکی لەم جۆرە هەیە دەڵێ:

(( قام سلطان بحدي خيله مدت الخنفسة رجلها))[63].

هەبوونی ئەم جۆرە پەندە هاوبەشە لە ڕووی واتاوە لە نێوان میللەتی کوردو عەرەب دا بەڵگەی ئەوەنیە کە یەکێك لەو میللەتانە ئەم پەندەی لەوی تر وەرگرتووە, بەڵام لەوانەیە لەم قۆناغەی ژیاندا (قۆناغی کشتوکاڵ) لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر لەیەك بچەن و ئامرازەکانی بەرهەم هێنانیشیان تا رادەیەك یەك چەشن بن یاخود مەڕو ماڵات و ئاژەڵی ژینگەیان جۆرە هاوبەشێك لە نێوانیاندا هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا وەکو دەزانین جۆری قۆناغ وئاستی گەشەکردنی ئابوری ڕۆڵێکی گەورە لە دروست کردنی فیکری کۆمەڵایەتیدا دەگێڕن, بۆیە ئێمە بە دووری نازانین لەگەڵ هەبوونی جۆرە جیاوازیەك لە ڕووی ڕەمزەوە, کەلەپوری هاوبەش و لەیەك چوو لە نێوان ئەو کۆمەڵانە لەیەك قۆناغ دا سەرهەڵبدات.

# ئەنجامی باسی چوارەم

**دەتوانین ئەنجامەکانی ئەم باسە لەم خاڵانەی خوارەوە بە کورتی دەست نیشان بکەین:-**

1- مرۆڤی کورد بیری زۆر وورد بووە و توانیویەتی بۆ ڕەخنەگرتن لە دام و دەزگا و کارو کردەوەی چەوتی ئەندامانی نێو کۆمەڵ پەنا بەرێتە بەر پەند و قسەی نەستەقی کۆمیدی- گاڵتە ئامێز بۆ دەربڕینی بیروڕاکانی خۆی.

2- ئەو نموونانەی لەم بابەتەدا بەکارهاتوون دەکرێن بە دوو بەشەوە:-

أ- :ئەو پەند و قسە نەستەقانەی کە راستەوخۆ بە زمانی مرۆڤەوە وتراون.

ب- :ئەو پەند و قسە نەستەقە کۆمیدی- گاڵتە ئامێزانەی کە بەزمانی ئاژەڵ و گیانلەبەرانی ترەوە وتراون. ئەمانەش بە گوێرەی ژینگە و قۆناغی کۆمەلایەتی لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیکە, لەپاڵ هەبوونی جۆرە هاوبەشی یەك دا جیاوازییان هەیە.

3- جۆری ڕەخنە و بیروڕاکانی خەڵکی لەم جۆرە نموونانەدا بە گوێرەی جیاوازی چینایەتی و ململانێی نێوان چینەکانی نێو کۆمەڵگای کوردستان دەگۆڕێ و هەریەکەیان ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندی چینێکی دیاری کراون.

4- ئــەو پەند و قسە نەستەقانەی لەم باسەدا هاتوون زۆربەیان بەرهەمی یەك قۆناغی دیاری کراوی ژیانی میللەتی کوردن بە تایبەتی ئەوانەی کە بەزمانی ئاژەڵەوە وتراون ئەویش قۆناغی (کشتوکاڵی و ئاژەڵ ڕاگرتنە) و لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان دا لە ڕوی هێما و مەبەستەوە لە یەك دەچن و یەك ئامانجیان تێدا دەردەکەوێت. واتە لە سەردەمێکدا وتراون کە زۆربەی گەڵی کورد لە سایەی یەك پەیوەندی کۆمەڵایەتی- ئابووریدا ژیاون.

5- هەریەك لەو گیانلەبەرانەی لێرەدا ناویان هاتووە هێمان بۆ هەندێ کار و کردەوەی دزێوو لە ڕێی ئەوانەوە خراونەتە بەر ڕەخنەیەکی کۆمیدی- گاڵتە ئامێزانە وەکو ڕێوی بۆ فێڵبازی و گورگ بۆ مشەخۆری و مێشوولە بۆ لە خۆبایی بوون و کەر بۆ بێ عەقڵی و گەمژەیی... هتد.

6- ئەو نموونانەی لەم باسەدا خراونەتە بەرچاو جۆرە گاڵتە پیٚ کردن و ڕەخنە لیٚگرتنیٚکی کۆمیدیانەیە تەنیا بە مەبەستی پیٚکەنین بەکار نەهاتوون بەڵکو لە ناواخن دا دەبیٚتە پاڵ پیٚوە نەریٚك, بۆ ئەوەی هانی مرۆڤ بدا بە گاڵتەکردن بەڕەفتاری خراپ و ناپەسەند بەخۆدا بچیٚتەوە و لە ڕابردووی ناشیرینی کردەوەکانی پەشیمان ببیٚتەوە و بەرەو چاك بوون بچیٚ... .

# پەراوێزەکانی باسی چوارەم

1- د.عیزەدین مستەفا رەسول/ *لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی*/ چ 2/ زانکۆی سلێمانی/ 1979/ ل 142-143.
2- ئەحمەد سالار/ **کۆمیدیا**/ چاپخانەی زانکۆی سلێمانی/ 1981/ ل 18.
3- لطفي خوري في علم التراث الشعبي/ **منشورات وزارة الثقافة و الفنون**/ الموسوعة الصغيرة/ العدد 40/ الجمهورية العراقية/ 1979/ ص 42.
4- شێخ محەمەدی خاڵ/ **پەندی پێشینان**/ چ 2/ 1971/ ل 138.
5- مەلا مەحمودی دێرشەوی/ **مشتا خاچیا ژگوتنێن پێشیا**/ چاپخانەی (شفیق)/ بەغداد/ ل 381.
6- لەوانەیە پەندە کوردییەکە وەرگێڕاوی پەندە عەرەبییەکە بێت چونکە هەمان مەبەست و واتا دەگەیەنێ ئەگەرچی لە دیالێکتی کرمانجی ژووروش دا ئەم نموونەیە هەیە کە دەڵێت: (هەرچی دەرگەهێ ئێکی بقوتت, دەرگەهێ وی ژی بێ قوتان)/ بڕوانە مەلا محمودی دێرشەوی/ هەمان سەرچاوە/ ل 81.
7- مەلا مەحمودی دێرشەوی/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 84.
8- عەلی مەعروف شارەزووری/ **پەندی پێشینانی کورد**/ ب 1/ چ 1/ چاپخانەی الحوادث/ بەغدا/ 1981/ ل 94.
9- د.عزەددین مستەفا ڕەسول/ **لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی**/ چ 2/ زانکۆی سلێمانی/ 1979/ ل 162.
10- شێخ محەمەدی خاڵ/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 100.
11- **هەمان سەرچاوە**/ ل 107.
12- **هەمان سەرچاوە**/ هەمان لاپەڕە.
13- ف.أ.لينين/ **في الادب والفن**/ ج 1/ ترجمه عن الروسيه يوسف حلاق/ منشورات وزاره الپقافه/ دمشق/ 1973, ص 43 .
14- نفس المصدر/ ص 44 .
15- شێخ محەمەدی خاڵ/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 18.
16- علی مەعروف شارەزووری/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 31.
17- شێخ محەمەدی خاڵ/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 35.
18- ف.أ.لينين/ **نفس المصدر**/ ص 62 .
19- المصدر السابق/ **نفس الصفحه** .
20- د.عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 133.
21- شێخ محەمەد خاڵ/ **سەرچاوەی پێشوو**/ ل 466/ ل 468.
22- **سەرچاوەی پێشوو**/ هەمان لاپەڕە.
23- **هەر ئەوێ**/ ل 198.

24- محمد ابو صوفة/ **_الامثال العربية ومصادرها في التراث_**/ مكتبة الاقصى/ عمان ـ الاردن/ 1982/ ص 9 ـ 10.
25- سورة الاحزاب/ الاية 33.
26- _جمال محمد فقى رسول الباجوري_/ **_المرأة في الفكر الاسلامي_**/ ج 1/ الامانة العامة للثقافة والشباب في منطقة الحكم الذاتي/ 1986/ ص 127.
27- _شێخ محەمەدی خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 462.
28- عبدالمحسن بەنی وەیس/ **_گەردانەی ئەڵوەن_**/ دەزگای رۆشنبیری بڵاوکردنەوەی کوردی/ کۆماری عێراق/ بەغدا/ ل348.
29- _شێخ محەمەد خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 464.
30- _عەلی مەعروف شارەزووری_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 106.
31- _د.عیزەددین مستەفا رەسوڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 124.
32- هەمان سەرچاوە/ ل 165.
33- الكزندر هجرتي كراب/ **_علم الفلكلور_**/ ترجمة رشدي صالح ـ القاهرة/1967/ ص 114/ هەروەها بڕوانە: لطفي خوري/ **_في علم التراث الشعبي_**/ الموسوعة الصغيرة/ العدد 40/ منشورات وزارة الثقافة و الفنون/ **_الجمهورية العراقية_**/ 1979/ ص46.
34- _لطفي خوري_/ **_المصدر السابق_**/ ص 47.
(*) بڕوانە: الكزاندر هجرتي كراب/ **_المصدر السابق_**/ ص 115.
35- _شێخ محەمەد خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 461.
36- **_هەمان سەرچاوە_**/ ل 33.
37- _قەناتی کوردۆ_/ **_کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی_**/ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا/ 1976/ ل 237.
38- _شێخ محەمەد خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 112.
39- _قەناتی کوردۆ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 244.
40- _مەلا مەحمودی دێرشەوی_/ **_مشتاخاچیا ژ گوتنین پێشیا_**/ چاپخانەی (شفیق), بەغدا, 1980, ل 128.
41- _عبدالمحسن بەنی وەیس_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 104.
42- _شێخ محەمەدی خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 462.
43- _سیرغی میخالکوف_/ **_کل شیء یبدئ من الطفولة_**/ موسکو- دار التقدم/ 1978/ ص 64.
44- _عبدالمحسن بەنی ویس_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ص 234.
45- _شێخ محەمەدی خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**, ل 120.
46- _قەناتی کوردۆ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 237.
47- **_هەمان سەرچاوە_**/ ل 244.
48- سیرغي میخالکوف/ **_المصدر السابق_**/ ص 64.
49- عبدالمحسن بێني ويس/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 200, هەروەها هەمان پەند لە شێوەی کرمانجی خوارووداهەیە بڕوانە/ _شێخ محەمەدی خاڵ_/ **_سەرچاوەی پێشوو_**/ ل 383.
50- محمد سعيد مبيض/ **_الحكم والامثال الشعبية في الديار الشامية_**/ دار الثقافة/ ط 1/ قطر- دوحة/ 1986/ ص 357/ تێبینی: لە پەندە عەربییەکەدا لە جیاتی ئاژەڵ مرۆڤ بەکار هاتوو.

51- *قەناتی کوردۆ*/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 244.
52- شێخ محەمەد خاڵ/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 121.
53- *عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی*/ ***پەندی کوردی*** /ب 1/چ 1/چاپخانەی کوردستان ـ هەولێر/ ل 70.
54- *عطا رفعت*/ ***من امثال البادية والريف***/ مطبعة سلمان الاعظمي ـ بغداد/ 1978/ ص 38.
55- *عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی*/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 74.
56- شێخ محەمەد خاڵ/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 462.
57- ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 243.
58- ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 39.
59- هەر ئەوێ/ ل 38.
60- عبدالمحسن بنی وەیس/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 153.
61- *مەلا مەحمودی دێرشەوی*/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 281.
62- *قەناتی کوردۆ*/ ***سەرچاوەی پێشوو***/ ل 241.
63- محمد سعيد مبيض/ ***المصدر السابق***/ ص 358.

# سەرچاوەکانی باسی چوارەم


1. ***القرآن الكريم.***
2. *ئەحمەد سالار*/ ***کۆمیدیا***/ چاپخانەی زانکۆی سلێمانی/ 1980.
3. *جمال محمد فقی رسول الباجوری*/ ***المرأة في الفكر الاسلامي***/ ج1/ الامانة العامة للثقافة و الشباب في منطقة الحكم الذاتي/ 1986.
4. *د. عیزەددین مستەفا ڕەسول*/ ***لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی***/ چ2/ زانکۆی سلێمانی ـ 1979.
5. *علی مەعروف شارەزووری*/ ***پەندی پیشینانی کورد***/ ب1/ چ1/ چاپخانەی 9 ظوالحوادث/ بەغدا/ 1981.
6. *عبدالمحسن بنی وەیس*/ ***گەردانەی ئەڵوەن***/ دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن/ دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی/ کۆماری عێراق/ بەغدا.
7. *عومەر شێخەڵڵا دەشتەکی*/ ***پەندی کوردی***/ ب1/ چ1/ چاپخانەی کوردستان ـ هەولێر.
8. *عطا رفعت*/ ***من امثال البادية و الريف***/ مطبعة سلمان الاعظمی ـ بغداد/ 1978.
9. *شێخ محەمەدی خاڵ*/ ***پەندی پێشینان***/ چ2/ ؟ / 1971.
10. *مەلا مەحمودی دێرشەوی*/ ***مشتاخا چیا ژگوتنێن پێشیا***/ چاپخانەی (شفیق), بەغدا.
11. *محمد ابو صوفة*/ ***الامثال العربية و مصادرها في التراث***/ ط1/ مكتبة الاعظمي/ عمان ـ الاردن, 1983.
12. *محمد سعيد مبيض*/ ***الحكم و الامثالَ الشعبية في الديار الشامية***/ دار الثقافة / ط1/ قطر ـ دوحة, 1986.
13. *سيرغی ميخالكوف*/ ***كل شئ يبتدئ من الطفولة***/ موسكو/ دار التقدم/ 1987.
14. *ف.أ. لينين*/ في الادب و الفن/ ج1/ ترجمة يوسف حلاق/ منشورات وزراة الثقافة/ دمشق/ 1973.
15. *الكزاندر هجرتی كراب*/ ***علم الفلكلور***/ ترجمه رشدی صالح ـ القاهره/ 1967.
16. *لطفي الخوري*/ ***في علم التراث الشعبي***/ منشورات وزارة الثقافة و الفنون/ الموسوعة الصغيرة/ العدد 40/ الجمهورية العراقية/ 1979.
17. *قەناتی کوردۆ*/ ***کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی***/ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا/ 1976.

# ناوەڕۆك

# زنجیرە کتێبی دەزگای موزیك و كەلەپووری كورد

| زنجیرە | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ساڵی چاپ |
|---|---|---|---|
| 1) | بەرکوتێکی مەتەڵی فۆلكلۆری کوردی | سەدرەدین نورەدین ئەبوبەکر | 2005 |
| 2) | دەروازەیەك بۆ بۆتەکانی موزیك | غەمگین فەرەج | 2005 |
| 3) | وەرز و ساڵنامەی میللی لەپەند و شیعری کوریدا | پ . د شوکریە رەسول | 2005 |
| 4) | لەبارەی کۆکردنەوەی موزیکی میللیدا بە زمانی(کوردی عەرەبی) | مود کار بلیس و ئەرنولد باکیە.<br>اعداد:د.محمد زازا<br>و. تاریق ساڵح | 2005 |
| 5) | چلاواز 1 | وریا ئەحمەد | 2006 |
| 6) | پەندی کوردی: چیرۆکەکەی | عومەر شێخەڵلاَ دەشتەکی | 2006 |
| 7) | هێلکەی نامێ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی یەکەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 8) | هێلکەی نامێ<br>کۆمەڵێك ئەفسانە و حیکایەتی جۆرا و جۆری<br>فۆلکلۆریی نێو کوردەوارییە<br>بەرگی یەکەم/ بەشی دووەم | مەولود ئیبراهیم حەسەن | 2006 |
| 9) | خصائص أغاني الأطفال<br>في كوردستان العراق | گۆنا قادر | 2006 |
| 10) | پەندو قسەی نەستەقی ماچۆ | هەردەوێڵ کاکەیی | 2006 |
| 11) | سەربردەی کوردەواری | جەمال گردەسۆری | 2006 |
| 12) | کوردستان سمفۆنیك سویت | سیروان سیرینی | 2006 |

| | | | |
|---|---|---|---|
| 2006 | جەلال مەلا حەسەن، جەنگی جەلال | مریەم خان | 13) |
| 2006 | رەسووڵ ڕەش ئەحمەدی )هەڵوەدا مهابادی( | گۆزەی شکاو | 14) |
| 2006 | : الدكتور عمر ابراهيم عزيز(پەتی) | القيم السائدة في القصص الشعبية الكوردية و العرب للأطفال في العراق | 15) |
| 2007 | د. نەجم ئەڵوەنی | ئەفسانە و پەندی کۆمیدی گاڵتە ئامێزی کوردی | 16) |